

ناوی کتێب: ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزییەوە

بەرگی دووەم

نووسەر: خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ: تارا محەمەد

پێداچوونەوەی: بەهجەت جەمیل، بەفراو جەمال

تیراژ:( ٢٠٠٠) دانە

نۆبەی چاپ: یەکەم - ٢٠١٢

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە ( ١٢٧٨ ) ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێ دراوە

# ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزییەوە



## بەرگی دووەم

نووسینی

**خالید ئێرتوغرول**

وەرگێڕانی

**تارا محەمەد**

چاپی یەکەم

١٤٣٣ك — ٢٠١٢ز

# پێشەکی

ئەم بەرهەمە تەواوکەری کتێبی (ئەو ئافرەتەی لە دووی خۆی دەگەڕێت)ە کە پێشتر پێشکەشتان کرا. کتێبی (ئەو ئافرەتەی لە دووی خۆی دەگەڕێت) هۆگرییەکی بەرچاوی لای خوێنەران دروست کرد و، لە ئەنجامی خواستی زۆری ئەواندا، بەشی دووەمی ئەم کتێبە بە ناوی (ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزیەوە) لە خزمەتی ئێوەدا پێشکەش دەکەین. ڕووداو و بەسەرهاتی ئەم چیرۆکە ئاسودەیی دەڕژێنێتە ناو ناخەکانەوە.

(ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزیەوە)، چەندەها هەستی سەیر دروست دەکات لەپێناو زانینی ئەوەی بەدوای چیدا گەڕاوە و، چۆن خۆی دۆزیوەتەوە. بەهەرجۆرێك بێت دەبێت ئەم کتێبە بخوێنینەوە.

(ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزیەوە)، زۆر بەڕوونی بۆتان باس دەکات کە بەدوای چیدا دەگەڕێت، بێگومان ئێوەش زۆر بەخێرایی دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم چیرۆکە پڕنهێنی و سەرنجڕاکێشەوە.

ئەگەر ئێوەش دەتانەوێت ئەو شتانەی بۆی دەگەڕێن بیدۆزنەوە، سوود لە ئەزموونە بەنرخەکان و دنیا دیدەییەکانی ئەم کتێبە ببینین. هەروەها وانە لەو یادەوەرییە پڕ پەندانەی کە ئەم

ئافرەتە تیایدا ژیاوە وەربگرن. ئەگەر پێتان وایە ئامادەن بۆ داستانی ژیانێکی پڕ هەست و پەرۆشی .... فەرموون. دەمەوێت بزانن کە ڕەنگە ئەم کتێبە ببێتە بەسەرهاتی ژیانتان. بەئومێدی سودمەندیتان..

خالید ئێرتوغروڵ

# گێژاوی هەستەکان بەردەوامە



ئەمە بەشی دووەمی بەسەرهاتی نیلوفەر خانە...

ئایا تا ئێستا بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەی تۆفانی هەستە مرۆییەکانتان بیستووە؟

نازانم بە خوێندنەوەی ئەم بەسەرهاتە ناخ سووتێنەرەی نیلوفەر خان کاردانەوەتان چی دەبێت.

هەڵبەت من بە ئەستەم توانیم گوێبیستی ئەم بەسەرهاتە ناخ سووتێنەر و پڕ کارەساتە ببم و تۆماری بکەم.

چۆن بتوانین بەرگەی ئەم دیمەنگەلە پڕ لە پەند و هەڵوێستە بەرزانە بگرین؟! بەشی یەکەمی ئەم ڕووداوە سەرسوڕهێنەر و پڕ نهێنیانەی نیلوفەر خانمان لە کتێبی (ئەو ئافرەتەی لەدووی خۆی دەگەڕێت)دا پێشکەش کردن. ئەوانەی بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە ڕنوقمی لافاوی هەستەکانیان بوون، لەدوای خوێندنەوەی ئەم بەشەیان زیاتر دەکەونە دوورگەی هەستەکانیانەوە. کە تێکڕای بوونیان لەوێدا چڕبۆتەوە؟! ئیتر... لە بەسەرهاتی هەناسەبڕی نیلوفەر خاندا بەیەکەوە هەست بە ئازارەکانی، هەڵەکانی، عەشقی، پەندو وانەکان و، پەرۆشیی و خۆشحاڵیی دەکەین و لەگەڵیدا دەژین.

ئەوانەی کە توانای بەرگەگرتنیان هەیە، فەرموون ئێوەو ئەم ئەزموون و بەسەرهاتە..

به تێپەڕبوونی ڕۆژگار ئاگری ناو ناخی خۆمم پێ خامۆش نەدەکرایەوەو، گوناهو ناپاکییەکانی ڕابردوو و هەڵە گەورەکانم دەروونمیان تەنی بوو و، ڕۆحم بەردەوام بێزار بوو.

هەرگیز نەمدەتوانی تەنانەت بۆ یەك ساتیش بیری ئەو تەمەنە بێ کەڵك و پڕ شەرمەزارییە لە مێشکم وەدەرنێم.

ئەو ساڵە شوومانە، بەجۆرێك منیان خستبووە ژێر باڵەپەستۆی ئازارەوە کە هیچ کات یەخەیان بەرنەدەدام .. بۆ یەك چرکەش نەمدەتوانی بڵێم: "ئۆخەی، ڕزگارم بوو لە سووتانی دەروونم و، پارچە پارچەبوونی دڵمو، بێزارکردنی عەقڵم.

ڕابردووم بەجۆرێك بوو کە نازانم چۆن باسی بکەم؟! لەو ساڵانەدا هیچ شتێك نەمابوو لەگەڵ گوناه و، هەڵە و، سەرپێچییەکاندا لەدەستم نەدابێت. چۆن دەمتوانی ئەو ڕابردووە تاڵە لەبیر بکەم؟!

چۆن بتوانم لەیادی بکەم؟!...

ئەو گەنجینە کاتییەم، ئەو خۆدەرخستنە سەرنجڕاکێش و کاریگەرەم، ئەو جوانیەم کە بووبووە بەڵا بۆم، کەسانێکی نیەت خراپ و خاوەن سیمای ساختە و، دڵ پیس و، دژ بە ناموس و بێویژدانیان لەدەورم کۆکردبوویەوە. (گورگە برسییەکانی) دەورم کە بە هیچ جۆرێك هەستیان بە ئازاری ویژدان نەدەکرد، هێواش

هێواش منیان دەخستە ناو زۆنگاوێکەوە کە هیوای لێ دەربازبوونی نەبوو.

بە بەڵێن و، زەردەخەنە ساختەکانیان، ئەو فێڵە ئاشکرایانەی بەناوی خۆشەویستی و عەشقەوە دەیانکرد، منیان خستبووە دۆخێکەوە کە توانای دەربازبوونم نەبوو.

بەتەواوی کەوتبوومە ناو تەڵەی ڕاوچییەکانی ناموسەوە، کچێکی بێ چارەی نامۆ بووم، کە بە خەیاڵی بەرەو مەزنیی ڕۆیشتنی مرۆڤ فریوم خواردبوو و، ئالودەبووبووم بە شوێنی ڕازاوەو درەوشاوەو، بەو دەنگانەی مرۆڤ مەست دەکەن و، پڕن لە پارەو چەپڵەو هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی....

هەر ئەم جۆرە خەونانە بوون کەسایەتی و بوونی منیان سڕییەوە، ئەم جیهانە پڕ لە ناپاکی و دوور لە مرۆڤایەتیە بوو هەموو بوونی منی بزر کرد. ئاه، باسی چی بکەم، لەکوێوە دەست پێ بکەم؟!

خەیاڵە گەنجانە و کچانەییەکانم، ئابڕووم، جوانییە سەرسوڕهێنەرەکەم، عەشقە شێوێنراوەکەم، هاوسەرەکەم، خێزانەکەم و ئەو دۆستانەم کە بەدڵ و گیان دڵ خۆشیان دەویستم..

هەموویان یەك لەدوای یەك بوونە قوربانی ئەو مرۆڤ خۆرانە، ئەو دڕندانەی سەردەم، ئەو بەدخووە وێرانکەرانە..

بەرەو ئەوپەڕی نائومێدییان بردم، بەجۆرێك كە تا ماوەیەكی زۆر وام لێهاتبوو خۆمم نەدەناسییەوە.

تێكڕای پاكیزەیی و لاویم لە زۆنگاوی ناوبانگ و عەشقدا خنكان..

كاتێك چاوم كردەوە، بینیم كە وەك ڕێبوارێكی نامۆو ماندوو لەسەر ڕێگای ئەم ژیانە بەجێ ماوم.

لەم نێوەندەداو وەك ئەو كەسەی هیچ نەگبەتی و نەهامەتی نەدیتبێت و، بڵێت:"منیش بوونم هەیە، منیش مرۆڤێكم" و، بتوانێت لەبەرامبەر دۆستەكانیدا بەسەربەرزییەوە بوەستێت..

ئەو ئازارە ئەوەندە سەخت بوو كە هەموو ساتێك و هەموو چركەیەك وەك چەقۆ لە قووڵاییەكانی دڵ و ناخم هەڵدەچەقی.

هەستی شەرمەزاری ناخمی وێران و پەرێشان كردبوو. بەردەوام نەفرەتم لەخۆم دەكرد، ئیرەییم بە هەموو شتێك دەبرد، تەنانەت بەو باڵندانەش كە دەگەڕانەوە هێلانەكانیان، بۆلای بێچوەكانیان، تەنانەت بەو مریشكانەش كە لەگەڵ جووجكەكانیان دەگەڕانەوە كولانەكانیان... بەڵام چار چییە؟ دەمێك بوو كار لەكار ترازابوو.چەندین جار بە خۆمم دەوت:"خۆزگە لەبری ئەم شۆخ و شەنگییەم، لەبری ئەم جوانییەم، ناشیرینترینی دنیا بوومایە، بەڵام ڕووخسارو دەروونێكی پاكم هەبووایە."

**تۆبەم کرد :**

سەرەڕای هەموو گوناهەکانیشم، هێشتا هیوام بەو پەروەردگارە هەبوو کە هەرگیز بەندەکانی لەبیرناکات، ئەوەبوو سەرلەنوێ ڕوومکردەوە بارەگای میهرەبانیی ئەو زاتەو لە سایەی بەندە پاکەکانییەوە کەسایەتیم دۆزییەوە.

تۆبەیەکی هەمیشەییم کردو، بڕیاری دووبارەنەکردنەوەی تاوانەکانم دا. لەبەردەم پەروەردگاری خۆمدا دەپاڕامەوەو داوای پەناو میهرەبانیم دەکرد، بەجۆرێك ڕووم کردبووە ڕووگەی ئەو کە بەوپەڕی ماندوونەناسییەوە سەرم لەسەر بەرماڵەکەم بەرزنەدەکردەوەو، تا بەرەبەیان دەگریام. ئەمە تاکە دەروازەی ئومێدو تروسکەی هیوای بێچارەکانە.

بەڵێ، ئیتر لە کۆتاییدا پەروەردگارم ئەم پەناگەیەی پێ نیشاندام. ڕەنگە هۆکاری بەرەو هەڵدێرچوونی کچێکی ساویلکەی وەك من، لەبەر ئەمە بووبێت کە خوای گەورە هەلێکی تری بۆ ڕەخساندبم، تا بگەڕێمەوە سەر ڕێی ڕاست.

بە ڕووکەش کەسێکی سەنگین دەهاتمە پێش چاو، بەڵام گەردەلوولە هەڵکردووەکانی دەروون و، هاوارەکانی ناخم، شتی جیاوازتریان دەوت، لەتوانامدا نەبوو ئەو ڕابردووە تاریکە پشتگوێ بخەم و، ژیانێکی ئاسوودە دەست پێ بکەم. نە لەو کتێبانەی دەمخوێندنەوە، نە لەو قسانەی گوێم بۆ دەگرتن، نە لەو

ئامۆژگاریانەشی کە وەرمدەگرتن دڵم ئاسوودە دەبوو. تەنانەت بۆ ساتێکیش نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بکەمەوە کە کەسایەتی داوێنپاکی سەرەتای ژیانم بۆ بگەڕێتەوە. نەمدەزانی چۆن خۆم دەربازبکەم لە شوێنەواری ئەو گوناهانەی ناخمیان شێواندبوو. لەناو ئەو دۆزەخەدا، ڕۆژانە سەدان جار دەمردم و زیندوو دەبوومەوە. هەموو کات و ساتێك پەنام دەبردە بەر بارەگای پەروەردگارو، لەدووی میهری ئەو دەگەڕام و، لێی دەپاڕامەوە: "من دەبێت چی بکەم؟ چۆن دەتوانم لەو ئازارانە ڕزگارم بێت؟ پەروەردگارا، هەر تۆیت ڕێنیشاندەر".

تاکە دەروازەی هیوام لێخۆشبوونی نەبڕاوەی پەروەردگار بوو. لەگەڵ ئەمانەشدا لە هەوڵی ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی ژیانمدا بووم. تا هێواش هێواش پارچەکانی وێنەی بوونم بدەمەوە پاڵ یەك و، لە بەندایەتی خۆم بەرامبەر بەدیهێنەر تێبگەم.. بە هاوکاری هاوڕێ نوێکانم ژیانێکی تازەم پێکهێنابوو.

## دۆستی ڕاستەقینەم دۆزیەوە:

فریشتەگەلێکی بێگەرد کە خۆیان بۆ خودا یەکلایی کردبووەوە، هاودەمییان دەکردم و، وەك چاوەکانیان ئاگادارییان دەکردم. ئەوان بۆ من بوونە دایك، باوك، هاوڕێ، لەڕاستیدا بوونە پزیشك بۆ دەروونم. بەیەکەوە دانیشتین گفتوگۆی ئیمانی و

فێربوونی قورئانمان پێك هێنا، كه چەندین ساڵ بوو من لەو كەش و هەوا سەرنج ڕاكێشە ئیمانیە بێ بەش بووم.

بەڵام هێشتا لە توانامدا نەبوو میهرو ڕەحمەتی پەروەردگار بخەمە كارو، ئاهو ناڵەی دەروونمی پێ خامۆش بكەم. دیمەنەكانی ڕابردوو و تارماییەكانی ژیانی پێشووم بە بەردەوامی لەبەرچاومدا خۆیان دەنواند.

ئەو ئێوارەیە درەنگانێك، دوای تەواوبوونی گفتوگۆكانمان لە خانووە دوو ژوورییەكەمدا دیسان تەنیا مامەوە. ماڵەكەشم بۆ ژیانێكی نوێ ئامادەكردبوو و، ژوورێكم بۆ خوێندنی وانەی فێربوونی قورئان تەرخان كردبوو.

لەو ژوورە خنجیلانەیەدا بە بەرەكەتی خوای گەورەو، لەگەڵ كتێبەكانمدا كەشوهەوایەكی زۆر ناوازەم بۆ خۆم پێك دەهێناو، بەرزترین پلەو بەنرخترین ماڵ و سامانم بەرماڵی نوێژكردنەكەم بوو، جێگەیەكی نوستنی سادەشم هەبوو. ئەو سێ خاتوونە فریشتە ڕووخسارەش كە خوێندكاری زانكۆبوون، لە ژوورەكەی دیكەدا دەژیان.

هەموو بەیانییەك وەك پیشەی هەمیشەیی ئەو ڕۆژانەم تا درەنگان قورئان و ویردی جەوشەن و پەیامەكانی نوورم دەخوێندەوە. تا كاتی زۆرترم بۆ ئەم كارە تەرخان بكردایە، ناخم، چاوەكانم، هەستەكانم، تێرنەدەبوون. بەجۆرێك نوقمی ئەو

کەشوهەوایە دەبووم، کە دوای تێپەڕبوونی چەندەها کاتژمێر کاتێ بە ئاگا دەهاتمەوە دەمبینی وا خۆرهەڵهاتووە.

ئەو ساتەوەختە بەنرخانە منیان دەبردە دنیایەکی ترو، تەواوی هەستەکانیان دەخرۆشاندم. سەرەڕای ئەمانەش کاتێ لەسەر بەرماڵەکەم ڕووم دەکردە پەروەردگارم ئەوە ئیتر ساتێکی بەرگەنەگیراو و نامۆ و پڕ لە شەوق بوو.

## کەسایەتی و بوونم ون کردبوو:

ڕووکردنە بارەگای خوای گەورەو، پاڕانەوە لێی و، خۆدانەدەست ئەو و، داوای لێخۆشبوون کردن، لەگەڵ فرمێسک ڕشتن و هەناسە هەڵکێشاندا، ئارامییەکی ناوازەی دەبەخشی... خودایە، چ جوانیەکی سەرنج ڕاکێش بوو؟!

بەڵێ.. شەوێکی لەم جۆرە.. چەندین کاتژمێر دەستی پاڕانەوەم بەرەو بارەگای پەروەردگار بەرزکردبووەوە.

فرمێسکی لاوازی و بێدەسەلاتیم هۆن هۆن دەبارییە سەر بەرماڵەکەم، بە بەردەوامی دەپاڕامەوەو داوای لێخۆشبوونم دەکرد.بەوپەڕی پەرێشانییەوە لە دوا دەروازەی ئومێدم دەدا، بەلام ئەو هەڵەو گوناهانەی کە لە ڕابردوومدا نێژرابوون، ئەوەندە کاریگەر بوون و، ئەوەندە ڕەگێکی بەهێزیان داکوتابوو، کە بەردەوام ململانێیان لە دەروونمدا دروست دەکردو، دەبوونە کۆسپ لەبەردەم نزاو پاڕانەوەمدا لەخوای گەورە.

لەڕاستیدا چەندەها جار دەموت:"بەسە ئیتر، یەخەم بەردەن، نامەوێ بتان بینم، نامەوێ بتان بیستم".

ئەمەم دەوت و هەنسکم هەڵدەکێشاو دەگریام و دەپاڕامەوە. بەڵام چەند جار؟...... نازانم.

ناتوانم ئەو دیمەنە دڵتەزێنانەی ژیانم لەیاد بکەم، کڕین و فرۆشتن بە جوانیەکەمەوە، فریوخواردنم بە بەڵێنە هەنگوینییەکانیان، تەنانەت بووبوومە ئامرازی خۆسەرقاڵکردنی کەسانی ناپاکی سەر مێزی خواردنەوەکان و، هاودەمی گەشت و گەڕانەکانیان بە ئوتومبێلە ڕازاوەکانیان .. ئەو ڕۆژانەشی کە لە ژیانێکی بە ڕەونەق و ڕەنگاوڕەنگی پڕ لە چەپڵەوە بوومە کەسایەتییەکی شەرمەزارو ئابڕو شێوێنراو.

لەبەرئەوە ئەو شەوە بەجۆش و خرۆشەوە ڕوومکردە بارەگای خوای گەورە، ئەوەندە هاوارو سکاڵام کرد، لێدانەکانی دڵم زیادو زیاتر بوون و، لەهۆش خۆم چووم.

کاتێك بە ئاگا هاتمەوە، بەوپەڕی لاوازییەوە لەسەر بەرماڵەکەم کەوتبووم.

چۆن پەرێشان نەبم؟! تەواوی خەونەکانی لاویم، حەسرەتی لەدەستچوونی ماڵە خنجیلەو پڕ میهرەکەم، کە پڕبوو لە دەنگی قاقای منداڵەکانم، هاوسەرەکەم کە بە هەست و سۆزێکی پاك و بێگەرد منداڵەکانی پەروەردە کردبوو. هەمووی وەك خەیاڵیان

لێهـات. لەبەرئەمــە بــوو كـاتێ لــە دەورووبەرمــدا هاوتەمــەن و دۆستەكانم لەو ژیانە پڕ خۆشەویستی و سۆزەدا دەبینی، ئیرەییم پێ دەبردن. ئاخر چۆن وا نەبم؟!

هــەركات لەگــەڵ نـورای خـان و ســەیدای هـاوپۆلم ڕووبــەڕوو دەبمــەوە لــە خەمباریـدا نقـوم دەبم. نـورای خـان سـەركەوتووانە خوێندنی تەواو كردو، هاوسەرگیری پێكهێنا. لـە كۆمەڵگـەدا پلـەی سەربەرزانەی بەدەست هێناو، ئێستاش تەمەنی لە خزمەت قورئان و باوەڕەكەیدا بەسەر دەبات.

ئێسـتا (سـەیدا)ش لــە دەرەوەی شـارە، چـونكە پزیشـكێكی كارامەو لێهاتووی لێ دەرچووە. لەپاش كۆچی دوایی هاوسەرەكەی تەمەنی خۆی خستە خزمـەتی كۆمەڵگـە. لەڕاسـتیدا ئـەو عەشـقی تەمەنی لاوییم بوو و، ئامادەبووم هەموو كارێك ئەنجام بدەم تەنها بۆ ئەوەی ژیانی هاوسەری پێـك بهێـنین... بـەڵام بەداخـەوە ئەمـە ڕووی نەدا... من ڕێگەیەكم گرتەبەر كە ئەنجامەكەی تـەنها بـەرەو هەڵدێرچـوون بـوو، بـەڵام لـە بەرامبـەردا سـەیدا بـەهیچ جۆرێـك دامــەزراویی و ئــارامی خــۆی تێكنــەدا. دوای كۆچــی دوایــی هاوســـەرەكەی ســـەیدا، ئـــەنجامی هەوڵـــەكانم بەمەبەســـتی خۆشەویستی ئەو بێ ئاكام بوو.

ئـەو هۆكـارەی بووبـووە هـۆی هۆگریـوونی مـن بـە كەسـایەتی (سەیدا)وە، ئومێـدی مـن بـوو بـۆ سـوودوەرگرتن لـە هەڵوێسـت و

دونیا دییەیی ئەو، هەروەها هیوادار بووم کە وەك پارێزگاری لێکەرێك بێت بۆم. بەڵام بەهۆی هەڵوێستی وەفادارانەی سەیداوە تەنانەت دوای مردنی هاوسەرەکەشی ئامادەنەبوو کە دووبارە ژیانی هاوسەرگیری پێکبهێنێت. لەڕاستیدا تا ئەم چرکەساتەش خۆشەویستیم بۆ ئەو بێ ئەندازەیە. بەڵام کەسێکی سەرلێشێواوی وەك من هیچ هیوایەکی نەبوو بەوەی کەسێکی پاك و بێگەردی وەك سەیدا بایەخی پێ بدات.

بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو نائومێدیەشم، هێشتا لەو بابەتە هیوا بڕاو نەبووبووم.

پاش کۆتایی هاتنی شەوێکی پڕ لە پاڕانەوە، بەهیوایەکی نوێوە ڕۆژێکی نوێم دەست پێ کرد.

## مژدەیەك ..

ڕۆژێك، یەکێك لە هاوپۆلەکانم بەناوی (شەیما)، کە پێکەوە لەیەك خانوودا نیشتەجێ بووین، بە ڕووخسارە شیرین و گەشاوەکەی خۆیەوە هاتە لامو، وتی:

– نیلوفەر گیان، دەزانی خەونێکم بە تۆوە بینیوە !

وتم:

– إن شاء الله خێر دەبێت!

لە ڕاستیدا خەیاڵی ئەو خەونەی کە کچێکی بێگەردی وەك شەیما بە منەوە بینیبووی سەرقاڵی کردبووم.

لـەکاتی گێڕانـەوەی خەونەکەیـدا شـڵەژاویی لـە چـاوەکانیدا دەخوێنرایەوە. وتی:

- دادە نیلوفەر، نازانم چۆن دەست پێ بکەم؟

کـاتێ بـە گـەرمی لـە ئـامێزی گـرتم، شـڵەژاوییەکەی زۆر کـاری تێکردم. لە چەند چرکەیەکدا لێدانی دڵم زیادی کردو وتم:

- بۆ خاتری خوا، بۆم بگێڕەوە بـزانم چـی بـوو، خەریکـە دڵـم دەوەستێت.

- شـەو پـێش ئـەوەی بخـەوم سـورەتی (یاسـین)م خوێنـد و، دوعای خێرم بۆ کردیت. وتم: "خودایە هیدایەتی دادە نیلوفەر بدە بۆ گرتنەبەری ڕێی سەرفرازی و ڕێگەچـارەیەك بـۆ نەهامەتیـەکانی ئەو بنێرە. ئێمە ئەومان زۆر خۆش دەوێت، خوایە گیان ئەومان بۆ بپارێزە".

بەم پاڕانەوەو پەرۆشییەوە خەوم لێکەوت.

لە خەونمدا، لە جێیەکی فراوانـدا بـووین، گفتوگۆمـان لـەبارەی (پەیامەکانی نوور)ەوە دەکرد.

خـانمێکی بێگـەرد و نـورانی و تەمـەن مامناوەنـدی قسـەی بـۆ دەکـردین، لـەمن نزیـك بـوەوەو، منـیش چـوومە تەنیشـتیەوە. نیگاکانی زۆر کاریگەر بوون و کەسایەتیەکی هێندە سەرنجڕاکێشی هەبوو کە منی بەخۆیەوە سەرسام کردبوو. ئەو خاتوونە وتی:

- من ئێوه دەناسم، بە نیلوفەری خوشکمان بڵێ: ئارام بگرێت، خودا هیچ بەندەیەکی دەردەداری فەرامۆش ناکات و، هیچ نزایەکی بە کوڵ و ڕاستگۆ ناگەڕێنێتەوە. لەبەرئەوە إن شاء الله دەروویەکی خێری لێ دەکرێتەوە، بەڵام لەبیری نەچێت کە هەر تاقیکردنەوەیەك وادەی دیاریکراوی خۆی هەیە.

ئەم ڕستە مژدە ئامێزانە وەك بروسکە دایان بەسەر خەیاڵمدا، هەموو ناخمیان هەژاند.

" لەبەرئەوە دەروویەکی خێری لێ دەکرێتەوە، ها ! "

ئای خوایە ! لە ناکاو چاوەکانم لێکناو سەرم قورس بوو و گێژی خوارد.

ئەمە هەواڵێك بوو کە وەك فریادڕەسێك هەموو ئومێدە ناکامەکانمی ڕزگار کرد.

دەبێت چ جۆرە دەروویەك بێت؟ هەرچۆنێك بێت با بێت، کەواتە خودا منی لەبیر نەکردووە؟! کەواتە ئەو فرمێسکانەی تا بەرەبەیان دەمڕشتن، ئەو چەندەها کاتژمێرە بەفیڕۆ نەچووە ! ؟

خودایە تۆ چەندە مەزنیت، چەندە باڵادەستی، چەندە میهرەبانیت! هەر دەروویەکی خێر تۆ لەمنی بکەیتەوە خۆی لە خۆیدا بۆ من خەڵاتێکی گەورەیە. بە پەرۆشییەوە چاوەڕێی ڕووداوەکانی داهاتوو دەکەم. ئیتر خەیاڵ و دەروونم بەو دەروازەیەوە سەرقاڵ بوو بوو. چۆن دەروازەیەکە؟ کەی بەڕوومدا

دەکرێتەوە؟ گۆڕانێکی چۆن لە ژیانمدا دروست دەکات؟ ئومێدەکانم چییان بەسەر دێت؟

یان پاشماوەی خۆڕاگریم بەرامبەر ژیان دەڕوخێنێ. یا ئەوەتا هەواڵێکی خۆشم لای سەیداوە بۆ دێنێ.

ئای خوایە! تەنانەت بیرکردنەوەش لەو بارەیەوە ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشێت. بەڵام ئاه و ناڵەی دڵە بریندارەکەم هەر لەنوێ بوونەوەدابوو، بە بێوچان چاوەڕوان بووم ئەو دەرگایە بەڕوومدا بکرێتەوە، هەموو ڕۆژێ چاو لەڕێی هاتنی چارەسەرێکی ئەفسوناویی بووم، تا ئاگری ناخم خامۆش بکاتو حەسرەتی دەروونم دابمرکێنێتەوە.

شەوانە تا بەرەبەیان دەست و دڵم دەکردەوە و دەپاڕامەوە: "خودایە، ڕزگارم بکە". لەم کاتانەشدا فرمێسکەکانم هۆن هۆن بەڕووخسارمدا دەهاتە خوارەوە.

نەمدەتوانی تەنانەت بۆ ساتێکیش سەیدا فەرامۆش بکەم. لەناو خەیاڵێکی بێ چارەدا دەژیام و، دەمووت: "ڕەنگە لەسایەی چاودێری ئەوەوە، تەمی ئازارەکانم بڕەوێنەوەو ئۆقرە بگرم".

لەو ڕۆژانەدا بوو، کە ئەو ڕووداوە سەیرەم بەسەرهات.. ئەو ڕۆژە بوو... ئەو ڕۆژە..

ئۆزلەم خان وتاری پێشکەش دەکرد. منیش لەگەڵ خوشکەکانی دیکەدا ئامادەی ئەو وتارە بووم، ئەوانەی لەو

گفتوگۆیەدا بوون؛ نورای خان، کە دۆستی گیانی بەگیانیی ژیانم بوو، مەلەك خان، کە پێم دەوت مامۆستا و، ئەو خانم و کچانەی تر لە بنەماڵە ناسراوەکانەوە.

دکتۆر (ئۆزلەم)یش قسەی بۆ دەکردین. ئای ئۆزلەم خان! تۆ چەند بەجوانی پێشوازیت لێ دەکردین و کەش و هەوای پڕ لە سۆز و خۆشەویستیت بۆ دەخولقاندین. بەردەوام لە خەمی کەسانی گیرۆدە و سەرلێشێواودا بوویت. من چۆن یەکەمین ساتی ئاشنایەتیم لەگەڵ تۆ لەبیردەچێتەوە؟ مەگەر دەستی دۆستانەی تۆ نەبوو کە سەرلەنوێ منی گەڕاندەوە بۆ ژیان؟! منێك کە لە سوچێکی نەخۆشخانەدا لەگەڵ مردندا دەجەنگام. مەگەر ئەو دەستەی کە ژیانی منی گۆڕی، دەستی میهرەبانی تۆ نەبوو؟ چۆن لەبیری دەکەم؟...

بۆ یەك چرکەش لەبیرم ناچێت کە چۆن بۆ من بوویتە دایك و خوشك، منی بێکەس و، بێدەسەڵات و، گیرۆدەی نەخۆشییەکی کوشندە بووم!

ئەگەر ئۆزلەم خانەکانی وەك تۆ نەبوونایە، نیلوفەرە شکستخواردووەکانی وەك من چییان بەسەر دەهات؟ خودا لە تەمەنی من بەرێت و بیخاتە سەر تەمەنی تۆ. خودا بە بەهەشتی بەرینت شاد بکات. خودا بەهەشتی هەمیشەییت بە خەڵات بداتێ.

هەر ئەوەندەی منی بینی، دەستبەجێ لە تەنیشت خۆیەوە جێیەکی بۆ کردمەوە و بانگی کردم.

- "نیلوفەر گیان، وەرە ئێرە".

لە بەرامبەر ئەو هەموو گرنگی پێدانەی ئەو خانمە بەڕێزەدا، هێندە شەرمەزاربووم نەمدەزانی چی بکەم، لەناخی خۆمدا دەموت: "ئاخر منی تاوانکارو گوناهکار کەی شایستەی گرنگی پێدانی ئەو کەسە ناوازە و پاك و بێگەردانەم؟" بڕوانە خودای گەورە چەندە میهرەبانە، تەنانەت میهرەبانیی بۆ منێکی فەوتاو و لەناوچووش دەردەبڕی و، گرنگی پێ دەدام.

لە تەنیشت ئۆزلەم خانەوە، خانمێك دانیشتبوو کە جلوبەرگ و هەڵسوکەوت و ڕووخسارێکی زۆر سەرنجڕاکێشی هەبوو. بالاپۆش نەبوو. زۆر بەجوانی خۆی گۆڕیبوو. ئارایشتی کردبوو، خانمێکی قەشەنگ بوو.. ئەو خانمە سەرنجی هەموو ئامادەبووانی کۆڕەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، لە ڕاستیدا منیش پەرۆشی ناسینی بووم. ئۆزلەم خان بە باسکردنی من دەستی بە قسەکانی کرد:

- پێم وابێ کەستان نییە کە نیلوفەر خان نەناسێت، ئەم خوشکەمان کە لە پێشبڕکێی شاجوانیدا پلەی بەرچاوی بەدەست هێناو، ئەوە چەند ساڵە ناوی لەسەردێڕی هەواڵەکان نایەتەخوار... هەروەك بەڕێزیشتان دەیبینن ئەوەی کە شایستەی بوو دۆزییەوە.. ڕووی کردە ڕێبازی خواپەرستی".

له دڵەوە هاوارم کرد:"ئاه.. ئومێدەوارم وابێت ئۆزلەم خان".

چەندە ئاواتەخوازم کە ئاوا بێت. چەند خۆشە مرۆڤ لەو ژیانە پڕ شەرمەزارییە ڕزگاری ببێت. چەندە حەزمدەکرد ڕابردووم بسڕمەوە و لەناوی بەرم. لەبەردەم ئەو خوشکە پاك و بەڕەوشت و دڵسۆزانەمدا چەندە هەستم بە شەرمەزاری دەکردو، خۆم بە بچووك دەهاتە پێش چاو. بەداخەوە ئەو جوانییەم مێردەزمەیەکی خنکێنەری ڕۆح و ژیان و خەیاڵەکانم بوو.

## پێشکەشکاری پێشەنگ :

ئۆزلەم خان ڕووی بەلای ئەو خانمە سەرنجڕاکێش و قەشەنگەدا وەرگێڕا:

– ڕەنگە هەندێکتان ئەم خوشکەمان بناسێت، پێشکەشکاری بەتوانا (سەرپیل) خانە.

هەر کە ناوی (سەرپیل) لە دەمی ئۆزلەم خان هاتەدەر، هەموو ئامادەبووان دەنگی "ئۆو" لە ناویاندا بەرزبووەوەو، نیگا شیرینەکانیان بەجوانیی هەستی پێ دەکرا.

ئۆزلەم خان بەردەوام بوو لە قسەکانی:

– سەرپیل خان میوانی ئەمڕۆمانە، باوکی کۆچی دوایی کردووە، بێگومان وەك هەر نەوەیەکی دونیا کۆچی دوایی باوکی ناخی خوشکەکەمانی سووتاندووە و، کاریگەری تەواوی لەسەر ژیانی بەجێهێشتووە، هەرچەندە خۆی تەواو ئامادە نییە تا قسە

بکات، بەڵام ئێمە دەمانەوێت کورتەیەك لە چیرۆکی ژیانی ببیستین.

لەناکاو سەرنجی گوێگرەکان بۆ بیستنی بەسەرهاتەکەی زیادی کردو، هەمووان بێدەنگ بوون. بەگشتی خانمانی ئامادەبوو وابەستەی سەرپیل خان بووبوون.

سەرپیل خانیش سەرەتا ئامادەنەبوو قسە بکات، دواتر بەهۆی داواکاری زۆرو پێداگری ئامادەبوانەوە کەوتە قسە کردن:

- من تاقە کچی ماڵی خۆمان بووم. باوکی رەحمەتیم دەیویست لە کۆرسی خوێندنی قورئاندا بەشداریم پێ بکات، بەڵام من بەهۆی کاریگەری کۆمەڵێ کەسی دەووربەرم، رێگەیەکی ترم گرتەبەر... گەنج بووم، جوان بووم، سەرنجی زۆرینەی کەسانی دەورووبەرم رادەکێشا. مامۆستاکانم و هەندێ لە رێکخەرانی تر، بە هەموو جۆرێك لەسەر هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ئەو جوانیەم سووربوون. لەبەر ئەم هۆیەش بوو وەها رێگەیەکم هەڵبژارد. بەڵام ئەوە رێگەیەك بوو کە منی لە خێزانەکەم جیاکردەوە. سەرەتا دایکم لەدەست دا. بەداخەوە دایکی دیندارم بە زویری رۆیشت. بەر لە مردنیشی وتبووی:"گەردنی ئازاد ناکەم" ... ئەو قسەیەی بەردەوام وەکو ئاگر ناخم دەسوتێنێ." سەرپیل خان لەوە زیاتر بەرگەی نەگرت و دەستی کرد بە گریان، دەستی بە رووخساریەوە

گرت و بۆ ماوەیەك هەوڵیدا بە فرمێسکەکانی ئەو سووتانەی دەروونی خامۆش بکات.

سەرپیل خان بەردەوام بوو:

– ئاه دایکە گیان.. ئاه! ئەوم لەدەست دا. گەورەترین دەوڵەمەندی و سامانم لە دەست دا. هەرگیز لە یادم ناچێت کە وتوویەتی: "گەردنی ئازاد ناکەم". ئەمە چەندین ساڵە ئەم قسەیەی من دەمتوێنێتەوەو، دەمڕوخێنێ.. خۆزگە ئەو ڕێگەیەی دایکم دەیوت دەمگرت و نەوەیەك دەبووم کە نزاکانی دایکم پێ بکات. لەوانەشە بەهۆی ئەو دوعا خراپانەی دایکمەوە بووبێت کە لەو ژیانە پڕ خۆشگوزەرانی و ڕەونەقە و، لەو هەموو ناوبانگەدا بەختەوەریم نەدی. لە دەوروبەرەکەیشمدا دۆستێکی بەوەفا و دڵسۆزم نەدۆزییەوە.

بەداخەوە زۆرێك لەو کەسانەی کە خۆیان وەك دۆست نیشان دەدا، لەکۆتاییدا نیەت خراپ دەرچوون. ئەوان دوای ئەوەی مەبەستەکانیان دەهاتەدی، ئیتر ون دەبوون و دەڕۆیشتن.

یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی ژیانم بریتی بوو لەوەی هاوسەرگیرییەکی باش بکەم، ببمە خاوەنی ماڵێکی بێگەردو هاوسەرێکی دڵپاك، کە لە ناخەوە خۆشی بوێم و، ببمە دایك. بەتەواوی بوونمەوە ئەمەم دەویست، بەڵام نەبوو.. ناشبێت... ئەو بارودۆخەی ژیانم هەموو ئومێدەکانی ڕووخاندم. بە ڕووکەش

بەختەوەر و، لە ناخیشەوە گیرۆدەی دەروونێکی کەساس و پڕ لـە دڵتەنگی بووم.

لە ڕاستیدا من کە دەتان بینم ئێرەیی بەو ژیانە سەربەرزانەیەی ئێوە دەبەم. بۆئەوەی ببم بە یەکێك لە ئێوە، ئامادەم هەموو شتێك بکەمە قوربانی، بەڵام ئەمە ئەوەندە دوورە کە...

من تینووی خۆشەویستی و، خەمخۆریو گەرمی دۆستایەتی ڕاستەقینە دەکەم.

بۆ جاری دووەم سەرپیل خان نەیتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانی بگرێتو، نەیتوانی پێش بە سووتانی ناخ و، هاوارەکانی ڕۆحی بگرێت. لەبەرئەوە فرمێسکەکان بەسەر گۆنایدا هاتنە خوارەوە و ڕووخسارییان تەڕکرد.

## باسی منی دەکرد!!

وەك بڵێی ئەو باسی منی دەکرد نەك خۆی. ئەو ژیانەی ئەو باسی لێوە دەکرد، وەك ئاوێنەیەك بوو کە وێنەی منی تێدا دەبینرا. ئەم مەیدانی جەنگە تەنها ئەو نا، بەڵکو منیشی لەخۆی گرتبوو.زۆر چاك لە سەرپیل خان تێدەگەیشتم. زۆر باش لە وردەکارییەکانی جیهانە ڕازێنراو و ئارایشتکراوەکەی تێدەگەیشتم... دەبوو کێ لە من باشتر لە سەرزەنشتی نیگای دۆستەکانی و، لەگۆڕنانی خەیاڵی کچە بێ تاوانەکان و، سووتاندنی خەونەکانیان تێبگات؟!

لەو هۆڵەدا هەمووان ڕووخسارەیان خەم دایگرتبوو، هەمووان ئاوێزانی خەم و چاوەکانیان پڕ لە ئەسرین بوو... هەموو خانمەکان بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی ئەوە بوون گوڵ پێشکەشی سەرپیل خان بکەن.

سەرپیل خان بەردەوام بوو.

– دوو مانگیش بەر لە ئێستا، تەنها دۆستم، تەنها سامانم، تەنها ئومێدم، (باوکم) لەدەست دا.

باوکیشم لەم شێوازی ژیانەم ڕازی نەبوو، بەڵام ئەو هەستەی بە ئاشکرا پێ ڕانەدەگەیاندم، بۆ ئەوەی نەڕەنجێم. بەڵام من لە نیگاکانیەوە زۆر شت تێدەگەیشتم. مردنی ئەو بەجۆرێك خەمباری کردم، بە جۆرێك تووشی شۆکی کردم، کە لە باسکردن نایەت..

بۆ چەندین ڕۆژ لە ماڵەکەمدا مامەوەو نەدەهاتمە دەرەوە، ئەو خانمەی بۆ ئیش وکارو پاککردنەوەی ماڵەکەمان هاتبوو، دڵی بە حاڵم سووتابوو و ویستبووی دڵنەواییم بکات، بۆیە کتێبێکی بەناوی (جانان)ەوە لەسەر مێزەکەم جێ هێشتبوو.

(جانان) لە هەمان کاتدا ناوی ئەو هاوڕێ خۆشەویستەم بوو کە پێکەوە ئیشمان دەکرد. لەبەرئەوە ئەو کتێبە زۆر سەرنجی ڕاکێشام. هەڵمگرت و دەستم بە خوێندنەوەی کرد. دان بەوەدا دەنێم کە ئەوە یەکەم کتێب بوو دوای چەندین ساڵ خوێندبێتمەوە.

لەڕاستیدا دووتوێی چیرۆکی کتێبەکە، وێناکردنی ژیانی من بوو. چۆن شتی وا دەبێت خودایە!

لەناو ڕووداوەکانیدا ڕۆچووبووم. کاتێک کتێبەکەم تەواو کرد بەتەواوی تووشی شۆک بووم. چەندە کتێبێکی سەیر بوو! سەرەنجامی ڕووداوەکان چەندە سەرسوڕهێنەر بوون! زۆر بە ئەستەم توانیم بگەڕێمەوە سەر بارودۆخی ئاسایی خۆم. ئەگەر ئەم کتێبە چەند ساڵ پێش ئێستا بکەوتایەتە بەردەستم، لەوانەیە دایک و باوکم دڵیان لێم نەڕەنجایە.

جانان دەرگایەکی چاوەڕوان نەکراوی لە من کردەوە. ڕێگای ڕزگاربوونی بەڕوومدا والاکرد، هەنگاوەکانی چۆنیەتی گەیشتن بە خۆشبەختی و دڵنیایی پێ نیشاندام. گەیشتم بەو بڕوایەی کە پێویستە هەموو خانمێکی گەنج ئەم کتێبە بخوێنێتەوە.

## هاواری ناو گۆڕەکەی باوکم:

– ئەو خەونەی پێی دەڵێم (خەونی ژیانم)، هەر ئەو ئێوارەیە بینیم. خانمانی ناو هۆڵەکە بێدەنگ بوون، هەمووان بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی بیستنی پاشماوەی بەسەرهاتەکە بوون. بەوپەڕی سەرنجەوە لە سەرپیل خان ڕامابوون، دڵەکانیشیان وابەستەی ئەو بەسەرهاتەو سەرەنجامەکەی بووبوون.

سەپیل خان بەردەوام بوو:

– باوكی خوالێخۆشبووم وا لە جێگەیەكی زۆر خراپداو، لە شوێنێكی زۆر تەنگدا گیری خواردبوو و، هاواری دەكرد: "كچم، ڕزگارم بكە" ڕامكردە لای، بەڵام هیچم لەدەست نەهات. پرسیم:

– باوكە بۆچی كەوتوویتە ئەم شوێنە؟

ئەویش دەیناڵاند:

– ئەوانەی لە دنیادا بەندەیەكی گوێڕایەڵی پەروەردگاریان نەبن، ئێرە شوێنیانە، من زۆر ئازار دەچێژم. ڕۆڵە گیان شتێكم بۆ بكە.

منیش بەهەموو لایەكدا ڕامدەكرد بەهیوای ئەوەی بتوانم فریای بكەوم. لەم نێوەندەدا لەناكاو خاتوونێكی باڵابەرزو میهرەبان و باڵاپۆش پەیدابوو. پێی وتم:

– كچم خۆت ماندوو مەكە. باوكت سەرەنجامی كردەوەكانی دەبینێتەوە. جگە لە خودای گەورە هیچ كەس ناتوانێ بەهانایەوە بێت. بەڵام مژدەت لێ بێت، دایكت ڕزگاری بووە. دایكت خواپەرستییەكی بێگەردو كارو كردەوەی شایستەی ئەنجام داوە. بەڵام باوكت كاتێك لە ژیانی دونیا بووە زۆرێك لە فەرمانەكانی خوای خۆی پشت گوێ خستووە.

– باشە، من دەتوانم چی بۆ بكەم؟ بەرگەی ئەوە ناگرم باوكم لەم جێیەدا ببینم، ئازار بچێژێت. تكایە ڕێگە چارەیەكم نیشان بدە.

- کچم سەیرکە، مرۆڤ لە ژیانیدا خاوەنی هەر بیروباوەڕێك بێت، ئەوا لەسەر هەمان بیروباوەڕ دەمرێت و، کاتێکیش لە ڕۆژیی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە موحاسەبە دەکرێت و لەسەر کردەوە چاکەکانی پاداشت وەردەگرێت و، بەهۆی کردەوە خراپەکانیشیەوە سزا دەدرێت. دونیا مەیدانی تاقیکردنەوەیە، پەروەردگار لەدنیادا بەندەکانی تاقی دەکاتەوەو، لەڕۆژیی دواییدا پاداشتیان دەداتەوە. لەقیامەتیشدا پەشیمانی سوودی نییەو، یارمەتی و چارەسەرێك نییە تا دادت بدات...سەرەتا بڕۆ خۆت ڕزگار بکە. دواتر کردەوەو کاری جوان وەك دیاری بۆ باوکت بنێرە، چونکە هەموو کردەوەیەکی چاکی منداڵ لە نامەی کردەوەی دایك و باوکیشدا دەنووسرێت.

بەئاگا هاتمەوە.. تا ئەم ساتەش دەنگی ئەو هاوارو ناڵەیەی باوکم لە گوێمدا دەزرنگێتەوە. "کچم، ڕزگارم بکە" . هەرگیز ئەو هاوارەیم بیرناچێتەوە. کەسێکی میهرەبانی وەك باوکم ڕووبەڕووی لێپرسینەوەیەکی لەو جۆرە ببێتەوە، دەبێت حاڵی بەندەیەکی لە فەرمان دەرچووی وەك من چۆن بێت؟!

سەرپیل خان ئەوەندە خەمبارانە و ڕاستگۆیانە ئەم کۆتا دێڕەی دەربڕی، ناخی هەموو ئامادەبووانی کۆڕەکەی هەژاند.

"ئەی دەبێت حاڵی ئێمە چۆن بێت؟!"

## دەمەوێت لەم ژیانە ڕزگارم بێت:

سەرپیل خان لەنێوان هەنسکەکانیدا بەردەوام بوو:

- بڕیارمدابوو کە چیتر نابێت ژیانم ئاوا بڕوات... دەبوو چاوێك بژیانمدا بخشێنمەوەو ڕووبکەمە پەروەردگارم. چونکە ئەو ئازار چەشتنەی باوکم هەموو دنیای منیشی سەرەوژێر کردبوو.

نەمدەزانی دەبێ چی بکەم، چۆن دەست پێبکەم، بۆ لای کێ بچم..!

ماڵی ئاوابێت، سەیدا خانم جار جار بۆ کاری پاك کردنەوە یارمەتی دەداین و دەهاتە ماڵمان، ئەو خانمەی کە کتێبی (جانان)ی بۆ جێهێشتبووم. وتی دەمەوێت یارمەتیت بدەم و منی هێنا بۆ ئێرە. هەر بەهۆی ئەویشەوە بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا بەشداری کردن لە کۆڕی کەسانێکی پاك و بێگەردی وەك ئێوەدا بووە نسیبم. تکایە هاوکاریم بکەن، ڕێگەی ڕاستم نیشان بدەن، تا منیش وەك ئێوە بگەمە هەرێمی ئارامی و خۆشبەختی. تا خۆراکی گیانیی بنێرم بۆ باوکم، یارمەتی و توێشووی بەدیاری پێشکەش بکەم.. ببمە بەندەیەکی باشی خوای خۆم.

## تکایە یارمەتیم بدەن:

ئای خودایە! ئەو هاوارو پەنابردنە کاریگەرانەی سەرپیل خان ئەوەندە بەسوێ بوون، وەك بڵێی ئەو داواکاری "تکایە یارمەتیم بدەن"ەی تەنها بۆ خۆی نەبێت، بەڵکو بۆ هەموو ئەو کچە

گەنجانە بێت کە وەك ئەو لە گێژاوی ژیاندا شکستیان هێناوە. ئەو لەپێناو ئەوانیشدا هاواری دەکرد.

خانمەکانی ناو هۆڵەکە لەژێر کاریگەری هاوارەکانی ئەودا توابوونەوەو، لە هۆش خۆیان چووبوون.

هاوار و ئەسرینەکانی ئەو هونەرمەندە ناسراوە کە لە ژیانێکی خۆشگوزەرانی و ڕەنگاو ڕەنگەوە هاتبوو و دەیوت: "یارمەتیم بدەن" هەموو دڵێکی دەلەرزاند.

دکتۆرە ئۆزلەم هەوڵی دەدا دڵنەوایی سەرپیل خان بکات، بۆ ئەمەش تەفسیری قورئانەکەی هەڵگرت و دەستی کرد بە ئامۆژگارییەکانی...

ئەو باسەی دەمەوێ لەبارەیەوە بدوێم، مرۆڤ و ئامانجەکانی دەخاتە ژێر سەرنجەوە..

ئەمڕۆ هەموومان بەپەرۆشەوە گوێمان بۆ ئەم بابەتە ڕاگرت، چونکە لە ڕاستیدا زۆر پێویستمان پێی بوو، دیارە ئەو جۆرە باسانە زۆرجار ڕوون و ئاشکرانین و پێویستیان بە شیکردنەوەی زیاتر هەیە.

ئۆزلەم خان بەشێوازە تایبەتەکەی و بە نموونە زیندوو و بەڵگە سەرنجڕاکێشەکانی کەش و هەوایەکی مەعنەوی و ڕۆحی وای لە هۆڵەکەدا دروست کردبوو کە لە باسکردن نەدەهات.

دەمبینی سەرپیل خانیش وەکو من دەستەکانی گرتووە بەسەریەوەو لە حەسرەتی ئەو ساڵە بەهەدەرچووانەی تەمەنیدایە...

## لەقسەکانیدا پلەی ئێمەی وەك مرۆڤ بەرز نرخاند:

بەردەوام بوو:

- "لەڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە، مرۆڤ لەم جیهانە سەیر و فراوانەدا، خاوەنی پلەو پایەیەکی بێ هاوتایە. بوونی ماددی و مەعنەوی ئەو بەرهەمێکی ناوازەی خودایە.

خوای گەورە لەبارەی چۆنێتی دروستکردنی مرۆڤەوە لە سورەتی (التین) دا دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ التین:٤، واتە: سوێند بە هەموو ئەمانە! ئێمە ئادەمیزادمان لە جوانترین شێوەی ڕێکوپێکیدا دروست کردووە.

هەروەها لە سورەتێکی دیکەدا ئاماژە بە ڕۆڵی مرۆڤ دەکات لەسەر زەویدا و دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ البقرة: ٣٠.

واتە: خودا فەرمووی بە فریشتەکان: من دەمەوێ لەسەر ڕووی زەوی جێنشینێ بۆ خۆم دروست بکەم.

واتە مرۆڤ جێنشین و خاوەن پلەی هەرە باڵایە لەم دونیا فراوان و بەرینەدا.

لەبەرئەوەی مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، خوای گەورە مەلائیکەتی لەخزمەتیدا موسەخەر کردووەو، هەریەکەو کارێک ئەنجام دەدات کە بۆ ژیانی مرۆڤ پێویستە. خوای گەورە لەم بارەیەوە لە سورەتی (الإنفطار) ئایەتی (١٠و١١)دا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ*كِرَاماً كَاتِبِينَ﴾، واتە: بێگومان چەندین فریشتەی نیگابان چاودێریتان دەکەن، خاوەن پایەو قەدرن چاکەو خراپەتان دەنووسنەوە.

بەڵێ، ئەم فریشتانە هەموو کردەوەو گوفتارێکی مرۆڤەکان تۆماردەکەن ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق: ١٨.

"ئەو مرۆڤەی بە لاشە بچووکە، خۆی لە خۆیدا جیهانێکی بێ سنوورە". وەك چۆن مرۆڤ خۆی لەخۆیدا جیهانێکی بچووککراوەیە، لە هەمان کاتدا جیهانیش مرۆڤێکی بە قەبارە گەورەکراوە. چونکە لە جیهاندا چی هەبێت، نموونەکەی لە مرۆڤدا هەیە. "پێکهاتەکانی لە پێکهاتەکانی گەردوونە. مووەکانی لەش هەواڵی درەختەکانمان پێدەڵێن و، ئێسکەکان هەواڵی تاشە بەردەکانمان پێدەڵێن و، ئەو خوێنەی بەناو لەشدا هاتوچۆ دەکات و، ئەو ئاوانەی لە چاوەکان و لووت و گوێیەکان و دەمەوە دەڕژێن هەواڵی ڕووبار و، ئاوەکانی دەوروبەرمان پێدەڵێن"[1].

---

١- (وتەکان)، دانراوی مامۆستا (سەعیدی نوورسی)یە و، مامۆستا فاروق ڕەسووڵ یەحیا) لە عەرەبییەوە کردوویە بە زمانی کوردی.

مرۆڤ بەڕێزترین دروستکراوە. ئاژەڵانێکی وەك ئەسپ و وشتر سەرەڕای ئەوەی بەقەبارە لە مرۆڤ گەورەترن و لەڕووی جەستەیشەوە بەهێزترن، بەڵام خوای گەورە لەخزمەت مرۆڤدا موسەخەری کردوون. ئەوەتا ئەو وشترە قەبارە گەورەیە لەبەردەم مرۆڤدا بەچۆکدادێت و، وەکو هۆکاری گواستنەوە سوودی لێوەردەگیرێت. گیانەوەرە شیردەرەکان لەلایەن مرۆڤەوە سوود لەشیرو گۆشت و پێکهاتەکانی دیکەی لاشەیان وەردەگیرێت.

مریشك، دەنك دەنك خۆراك لەسەر زەوی کۆدەکاتەوەو دەیخوات تەنها لەپێناو ئەوەی خۆراکێکی بەتامی وەك هێلکەمان بۆ بەرهەم بهێنێت..

هەنگ، لەم گوڵەوە دەفڕێتە سەر ئەو گوڵ، تا هەنگوینێك کە پڕە لە شیفا بۆ ئێمە بەرهەم بهێنێت.

کەواتە مرۆڤ دەبێت لەوە تێبگات کە وەکو جێنشین ئەرك و ڕۆڵی خۆی هەیە لەسەر زەوی.

ئەو مرۆڤەی کە لە ڕووی لاشەوە لاشەیەکی ناوازەو، لەلایەنی ڕۆحییەوە ڕۆحێکی زۆر سەرسوڕهێنەری هەیە.

ئەو خودایەی کە هێزی بەخشیوەتە ئەندامەکانی جەستە، هەستی خەم و خۆشەویستی و ترسیشی بەخشیوەتە ڕۆح. بە ماددەکردنی ئەم هەستانەش کارێکی مەحاڵە.

ئەگەر بێین لەلایەنی زانستیشەوە، لە بوونی مـرۆڤ وردبینـەوە، لـەوە تێدەگـەین کـە دروسـتکراوێکی زۆر گـرنگ و پـڕ بایەخـە. ئاشـــکرایە خـــوای گـــەورە ئـــەو مرۆڤـــەی بـــە لاشـــە و ڕۆح و هەستەکانیەوەو بەو شێوازە ناوازەیە بەدیی هێناوە، بێگومان بـە بایـــەخ و وردبینییـــەکی زۆرەوە بـــەدیی هێنـــاوە. چـــونکە ئـــەو دروستکراوە بێ کەموکوڕی و مەزنە، ئەگەر بە ئاسانی زایـە ببێـت و لـەناو بچـێت، ئـەوا دەوروبـەرو کۆمەڵگەکـەی و بەدیهێنەرەکـەی زویرو بریندار دەکات.

## مرۆڤ دەبێت بیربکاتەوە:

کەواتـە پێویسـتە مـرۆڤ بیربکاتـەوە... وەرن بـا پێکـەوە بـیر بکەینەوە...

خوای گەورە لە سکی دایکمانەوە لـە نەبوونـەوە بـەدییهێناین و، چاومان بە دنیا هەڵهێنا. ڕۆزیمان هەر لـە سـەروو خۆشمانـەوە دابینکرا. بە گرنگییەوە بەخێوکراین، بە میهرەبانییەوە پـەروەردە کراین. ئەگەر میهرەبـانی دایـك و خۆشەویسـتی باوکمـان نەبوایـە، لەو قۆناغی لاوازییەی منداڵیماندا کێ بەرگەی دەگرت؟!

نازانم.. هیچ بیرتان لەمانە کردوەتەوە!

لەو ساتـەوەی کـە هاتووینەتـە ئـەم دونیایـەوە، چواردەورمان پـڕە لـە نیعمـەت و بەخشـش. لـەخۆرەوە گـەرمی و ڕووناکیمـان پێـدەگات، بـــەئاوی ســـازگار، پـــاك دەبینـــەوە، بـــە خۆراکـــە

جۆراوجۆرەکـان خۆمـان تێردەکـەین و، بـە هـەوا سـییەکانمان پڕدەکەین. هـەموو ئەمانـەشمان بـە بێ بەرامبـەر و بـە بێ ئـەرك کێشان بۆ دەستەبەر بووە.

ژێرییەك کە بەهۆیەوە لە دنیا تێدەگەین و، بینایییەك کە دنیـای پێ دەبینین و، ئەندامی بیستن کە دەنگـەکانی دەوروبـەرمانی پـێ دەبیسـتین و لەیـەکیان جیادەکەینـەوە... زمانێـك کـە بەهۆیـەوە تـامی خۆراکـە جیاوازەکـان لەیـەك جیـا دەکـەین، لووتێـك کـە بەهۆیـەوە هەسـت بـە بۆنـە جیاوازەکـان دەکـەین. ئەگـەر ئـەم ئەندامانە نەبوونایە، چیمان بکردایە؟!

لەو کاتەوەی پارووییەك دەخەینە نـاو دەممـان، تـا ئـەو کاتـەی هەرس دەبێت و فڕێ دەدرێت، چەندین گۆڕانکاری بەسـەردادێت و ئێمە ئاگامان لێیان نییە. ئەوەی ئێمە هەستی پـێ دەکـەین تـەنها تامی پاروەکەیە لـە دەممانـدا. ئـەی ئەگـەر کـاری دەم و ددان و گـەدەو کۆئەنـدامی هەرسـیش بـە دەسـت ئێمـە بوایـە چـیمان بەسەردەهات؟!

ئەگـەر ٢٤ کاتـژمێری شـەو و ڕۆژ، سـەرقاڵی کـاری گـەدە بووینایە، هێشتاش بەس نەبوو بۆی. ئایا تا چەند لە ڕێکخراویـی و وردیی ئەو سیستەمە بێ کەموکوڕییە ئاگادارین؟!

ئەگـەر لەبـەردەم ئـەم قەشـەنگی و مەزنییـەی دنیـادا، چاوەکانمان نەبوایە؟ ئەگەر لە بەرامبەر ئەو دەنگە خۆش و، تامـە

خۆشانەدا، گوێ و، زمانمان نەبوونایە!! ژیان چەند قورس و سەخت دەبوو!

کەواتە ... ئەو زاتەی گەردوونی دروست کردووە، هەر ئەوە مرۆڤیشی دروست کردووە. چونکە هەردووکیانی بۆ یەکتر گونجاندووەو، تەواوکەری یەکترن.

لەڕاستیدا مرۆڤ لەکاتی ئەنجامدانی هەر کارێکدا، بەرپرسیارێتی خۆی بەجێ دەهێنێت. ئەی ئایا نابێت بەرپرسیارێتی یەك تەمەن بەکارهێنانی ئەو نیعمەتانەش هەڵگرێت؟

مرۆڤێك هەر هەناسەیەك، هەر پەرداخێك ئاو و، هەر پاروویەك نان، ناتوانێ بەبێ حساب وەربگرێت. ئەی چۆن دەتوانێت دوای یەك تەمەن بەکارهێنانی نیعمەتەکان و بەهەدەر بردن و زیادەڕەوی... لەناو گۆڕەکەیدا بەئاسانی بحەوێتەوە؟!

لەوانەیە کەسێك زۆرجار بیربکاتەوە لە بەخشینی چەندەها برە پارەیەکی زۆر بۆئەوەی نەخۆشیی چاوێکی پێ چاك بکرێتەوە. ئایا تێناگات کە دەبێت چ نرخێك بدات لە بەرامبەر ئەو چاوە تەندروستانەی! لەوەی کە ئەو چاوانەی چەندە بەخششێکی مەزنن!

ئەی مێشك و دڵ و جگەرو قاچ و قۆڵ و ئەو ئەندامانەی کە تەواوی ژیانی پێ بەڕێ دەکات و لە ژماردن نایەن... ئایا ئەو کەسە چەندە قەرزار دەبێت؟ قەت بیرمان لەمە کردۆتەوە؟!

پێویستە پێکەوە بیربکەینەوە...

ئەو خودایەی کە بە هەموو پێداویستییەکانمان ئاگادارەو، هەر بەپێی ئەوانەش هەموو گەردوونی هێناوەتە بوون و، هەموو جۆرە پێداویستییەکی بۆ فەراهەم هێناوین. ئایا لەکاتی بوونی ژیانێکی هەتا هەتایی لەگەڵ خۆشەویستانماندا لەو دونیا، ئارەزووی بەخۆشیی ژیانمان لەم دونیایە بۆ دێنێتە دی؟

دایك و کۆرپەکەی، کە چەندە یەکیان خۆش دەوێت، لە یەکیان جیا دەکاتەوە؟ ئایا خەمی پێکەوەبوونی ئەوانە لەبەرچاو ناگرێت؟

ئایا هەموو ئەمانە ئاگادار کەرەوە نین بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ قیامەت و ژیانی هەمیشەیی لە بەهەشتدا؟

لە کوێوەو بۆچی هاتووین؟ دەچینەوە بۆ کوێ؟ کێ و چۆن لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکات؟

هەر کەسێك کە خاوەنی هۆش و ئەقڵ بێت، پێویستە بیر لەمانە بکاتەوە.

## خوا تۆڵەیان لێ بکاتەوە:

ئیتر هیچ کام لە ئامادەبووان تاقەتی بەرگەگرتنیان نەمابوو. سەرپیل خان تەواو نوقمی ئەو گێڕانەوەیەی بووبوو. بە دەم هەنسکەوە وتی:

خوا تۆڵەیان لێ بکاتەوە. بەهۆی ئەوانەوە هەموو بوونم دۆڕاند. مەودای بیناییمیان چەواشە کرد. ئەوان منیان لە دایکم و باوکم جیاکردەوە.

تاجی جوانییان کردە سەرم، منیان لەو دونیا خەیاڵی و ڕەنگاڵەییە نوقم کرد. منیان لە یادگارییە بەنرخەکانی ڕابردووم دابڕی. ئێستا لە بارودۆخێکدام کە جوانی ڕۆحم لە دەست داوە.

چی دەبێت، لەبەر خاتری خوا، ئێوە ببنە ڕێنیشاندەرم، تکاتان لێ دەکەم، جارێکی تر من مەدەنە دەست ئەو بەدخوو و فێڵبازانە. بەهانامەوە وەرن... بە هەموو مەرجێکتان قایل دەبم، ڕێگە مەدەن دووبارە ئەوان بێنەوە ناو ژیانم.

دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ لای خوای خۆم. دەمەوێ ڕێبازی پێغەمبەرەکەی بگرمە بەر. دەمەوێ چیتر تەمەنم لە خزمەتی ئەودا بخەمەکارو، هەرگیزاو هەرگیز نامەوێ بکەومەوە بەردەستی ئەو بکوژانەی مرۆڤایەتی.

ئەم هاوارو ناڵەو تکایانە، کام جەرگ و دڵ، کام دەروون بەرگەی دەگرن؟ کام دڵ نەدەتوایەوە؟ کام چاوی نەدەگریاند؟ وەك بڵێی ئەوەی ناخی دەسووتاو هاواری دەکرد، سەرپیل خان نەبوو من بووم... دەتوت ئەو باسی من دەکات.. هەر دەڵێی ئەو تکایانەی لەپێناوی مندا بوو...

ئای خودایە چەندە مەزنیت! چەندە باڵادەستیت! چەند دڵ و چەند تاوانبار بەهۆی خۆشەویستی زاتی تۆوە سووتاون و هەر میهرەبانی زاتی تۆشە بەرەو ڕێگەی ڕاست دەیان گەڕێنێتەوە.

لە کۆتاییدا سەرپیل خان بەرگەی نەگرت و باوەشی کرد بە ئۆزلەم خانداو وتی:

– خوشکەکەم.. چی دەبێت لێرەدا کۆتایی پێ بهێنین. ئێستا من دەبێت چی بکەم؟ با هەر ئێستا دەست پێ بکەم. من توانای بەرگەگرتنم بۆ یەك چرکەش نەماوە. یارمەتیم بدە، تکا دەکەم، ڕێگەم نیشان بدە.

لەو کاتەداو لەناو ئەو قەرەباڵغیەدا خانمێك هەستاو، سەرپۆشێکی لەناو جانتاکەیدا دەرهێناو، دایە دەست سەرپیل خان:

– بیگرە کچم.. با ئەمە یەکەمین بەڵگەی بەندایەتیت بێت. ئەم سەرپۆشە بدە بەسەرتدا. با فریشتەکانی خودا دەستخۆشیت لێ بکەن، وەرە لە تاوەبارانی ڕەحمەتی ئەو بنۆشە.. چونکە تەمەن زۆر کورتە. لەوانەیە هەلێکی ترت بۆ نەڕەخسێت. ئێمەش شایەتی تۆین. لە ڕاستیدا ئەمە سەرپۆشی ئەو کچەمە کە دوو ساڵ پێش ئێستا لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. ئەو شەوەی کە کچەکەم گەڕایەوە بۆلای خوای خۆی لەگەڵ هاوڕێکانیدا شەوی قەدریان زیندوو دەکردەوە. ئەو هەموو کاتێك

چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوو کە تیایدا بگەڕێتەوە بۆلای خوای خۆی. بە جۆرێك لەناو خواپەرستی و دنیای ڕۆحیی خۆیدا دەژیا کە لە باسکردن نایەت... بەردەوام لە خەونەکانمدا دەیبینم. پێم دەڵێ:"دایە، جێگەم بۆ ئێوە ئامادە کردووە، چاوەڕێتم".

بەڵێ.. ئەمە یادگاری ئاوەها کەسێکە. (إن شاء الله) سەرەنجامی تۆش ئاوا نوورانی دەبێت.

ئاه خوایە گیان! ئەمانە چ جۆرە هەستێکی دڵنیاکەرەوە بوون، ئەمانە چ کۆمەڵە پێشهاتێکی بێ وێنە بوون، چ یادگارییگەلێکی جوان بوون. تۆ بڵێی کەمێك لەمانە بە نسیبی ئێمەش بن؟!

سەرپیل خانیش سەرپۆشەکەی وەرگرت و، بۆنی پێوە کردو توند گرتیە ئامێزی:

– منیش ئەم ئەمانەتەی خوشکە شەهیدەکەمان وەکو تاجێکی پیرۆز هەمیشە لەسەر سەرم دەپارێزم.

لە کەشوهەوایەکی نوورانی و، تەسبیحات و، سلاوات دانماندا سەرپیل خان سەرپۆشەکەی دا بەسەریداو، دەستنوێژی گرت و، لەناو ئێمەو، لەگەڵ ئێمەدا، یەکەمین نوێژی کرد.

خوایە، ئەوە چ دیمەنێك بوو.. هەمان ئەو هەستەم بیر هاتەوە، کاتێ بۆ یەکەم جار نوێژم کرد، دووبارە ئەو تامەزرۆیی و چێژەم چەشتەوە. دووبارە ڕۆچوومەوە لەو جیهانە پاکەدا.

چەندە جوان و گەورەو بەنرخە لە خزمەتی ئیماندا بیت.

ئایا بۆ کەسانێك کە ڕاستی بوونی خۆیان و ژیانیان لەبیرکردووە، دەبێت چ شتێك لە سەرلەنوێ چەشتنەوەی ئیمان جوانتر و گرانبەهاتر بێت؟!

## یەکەمین دەستنوێژ... یەکەمین نوێژ:

بەم شێوەیە خوای گەورە ئەو بەهاو جوانی و چێژو پەرۆشییەی کردە نسیبی ئێمەش. ئێمەیەکی ناشایستە، بەڵام ئەو زاتە بە میوانداریی ئەو جیهانە گەورەو پڕ نهێنی و جوانیەی خۆی شادکردین.

ئەو کەش و هەوایە ئەوەندە سەرنجڕاکێش بوو، ئەوەندە پاك و بێگەردو ئیمانی بوو. کە لەو مەیدانەدا هەزاران نیلوفەرو سەرپیلت بەدی دەکرد کە لەناو گێژاوەکاندا نوقوم بووبوون و شەیدای دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست بوون.

پەروەردگارا.. میهرو لوتفی خۆتمان پێ ڕاببینە.. لەو ئازارانەی ژیان ڕزگارم بکە. لەو تاوانانەم خۆشبە کە ژیانیان وێران کردم، ئازاری ئەو ڕابردووەی کە بەردەوام ناخم دەسووتێنێت و، ڕۆحم ماندوو دەکات و، خەون و ئومێدەکانم هەڵدەوەرێنێت... ئەو ساڵە هەڵوەریوانەی تەمەنم بەردەوام خەمبارم دەکەن. بەردەوام ڕێگەم لێ دەگرن و دەبنە کۆسپ و، بەختەوەری و ئاسودەییم هەڵدەفڕێنن.

دووبـاره خـۆم لـه خـه‌یاڵی ئـه‌و ڕۆژانـه‌دا بینییـه‌وه‌.. جـارێکی تـریش تـووڕه‌یی و بێـزارییم گه‌یشـته‌وه‌ لوتکـه‌، دووبـاره خـه‌یاڵی به‌شه‌ڕهاتنم له‌گه‌ڵ ئه‌و فێڵبازانـه‌دا بـیر هاتـه‌وه‌، لـه گێـژاوی ئـه‌م خه‌یاڵانه‌دا بووم، کاتێك یه‌کێ ده‌ستی خسته سه‌رشانم..

– داده نیلوفه‌ر..!!

لـه‌دوای به‌جێگه‌یانـدنی نوێژه‌کـه‌مان و له‌گـه‌ڵ سـڵاواتدانمان له‌سـه‌ر گیـانی پـاکی پێغه‌مبـه‌رﷺ، لـه‌ناکاو ئـه‌و خانمـه هاتـه به‌رچاوم.

ئای خودایه.. ئه‌وه؟! به‌ڵێ خۆیه‌تی.. ئه‌وه‌ی که ڕێی نه‌دام به ناچاری ژیانم به‌ره‌و هه‌ڵدێرو مـه‌رگ بـه‌رم، ئـه‌وه‌ی کـه ڕێگـه‌ی لـه خۆکوشتنم گـرتو، هه‌سـتی خۆشویسـتنی ژیـان و ئومێـدی لـه‌لام زینــدوو کــرده‌وه. ئــه‌وه‌ی بــه هێنــده‌ی پــه‌ری و فریشــته‌کان میهره‌بانه. ڕووخسارێکی پرشنگداری وای هه‌یه ورەو هێـز بـه‌مرۆڤ ده‌به‌خشـێت، نهێنـی نیگاکـانی له‌توانایدایـه هـه‌موو نه‌خۆشـی و ئازاره‌کانی ده‌روون بره‌وێنێته‌وه.

– ئای خوایه، ئه‌مه تۆی! ها!

– داده نیلوفه‌ر، ئه‌وه منم.

– بۆ خـاتری خـودا تـۆ لـه کـوێ بوویـت! ماوه‌یـه‌کی زۆره بـه به‌رده‌وامی بۆت ده‌گه‌ڕام.

- ئای دادە نیلوفەر گیان، دەبێ لەکوێ بم! من هەر لە تەنیشتت بووم، بەڵام تۆی کە من نابینیت.

- خۆزگە شیاوی ئەم ڕێزەی تۆ بوومایە. خۆزگە شیاوی یارمەتیەکانت بوومایە.

- دادە نیلوفەر، تۆ بەجۆرێك دەستی یارمەتیت بۆ درێژ کردم، کە من بە درێژایی تەمەنم قەرزاری هەڵوێستەکەت بم.

- بەڵام من تۆ نابینم...!

- لەکاتی پێویستدا دەمبینی.

- چی دەبێت ئەگەر بەجێم نەهێڵیت.. هاوکارم بە.. دەستم بگرە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست. ئەم ڕۆژانە بەدەست کاریگەری تاوانەکانی ڕابردوومەوە دەناڵێنم. ناهێڵن هەست بە بەهای ئەم ژیانەم بکەم و، چێژ لە نیعمەتەکان وەربگرم.

- دەزانم دادە..

بەڵێ، هەر تۆی کە دەزانیت.. گومانم نەبوو لەم بابەتە.. بەڵێ ئەوە خۆیەتی.. کچە شەهیدەکەیە.. لەڕاستیدا من و ئەو کچە ئەفسوناوی و پڕ نهێنییە.. بەهۆی چەند پێشهاتێکەوە یەکترمان ناسی. من لەسەر شەقامێك ئەوم بە بریندارى هەڵگرتەوەو گەیاندمە نەخۆشخانە، کەمێك پارەشم بۆ چارەسەرەکەی بەجێ هێشت و ڕۆیشتم.

ئەمە هەمان ئەو کچەیە.. کە چەند ساڵ دوای ئەم ڕووداوە کاتێك لە ژێر فشاری ئازارەکانمدا بڕیاری خۆکوشتنم دا، ئەو بەهانامەوە هات. بەڵام نهێنی بابەتەکە ئەمە نییە. کاتێك من ئەم کچە بریندارەم بردووەتە نەخۆشخانە، پاش ماوەیەکی کورت کۆچی دوایی کردووە... بەڵێ، لەوێدا گیانی سپاردووە. دواتر ئەمەم زانی. بەڵام ئەو گیانی سپاردووە، بەڵام وەك خزر، وەك فریشتەکان بەردەوامە لە ڕزگارکردنی نیلوفەرە شکستخواردووەکان.

چونکە لە ڕاستیدا ئەو شەهید بوو..

– دادە نیلوفەر.. لەبیرت نەچێت.. دەستەڵاتی بوون و بەردەوامی ئەم گەردوونە لە دەستی خوادایە، هەر خۆی ئاگای لە تەواوی خورپەکانی دڵی بەندەکانیەتی... لە هانابردن و پاڕانەوەو گرتنەبەری ڕێگەی خوا بەردەوامبە.. ئەو زاتە نزاو داواکاری هیچ بەندەیەکی ڕاستگۆ ناگەڕێنێتەوە.. ئەو هەرگیز تکای بەندەکانی ڕەت ناکاتەوە.

هەر خۆی سەرچاوەی ڕەحمەت و ئومێدە.. جا بەندەکەی هەرچەند تاوانی کردبێت، ئەوەندە بەسە ئەو بەندەیە بە پەشیمانی و پەرۆشیەکی زۆرەوە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە، چونکە لە مەملەکەتی ڕەحمەتی ئەودا جێگە بۆ هەموو بەندەیەك

هەیە. ڕەحمەت و لێبووردەیی ئەو هەموو دروستکراوەکانی لەسایەی خۆیدا حەواندۆتەوە.

## بچۆ بۆ عەمرە:

من پێم باشە بچیت بۆ عەمرە.. لەو کەش و هەوا نموونەییەی ئەویدا کەمێك دەروونت بحەوێنەرەوە.. تا لە حزوری پێغەمبەردا ﷺ بگەیتە دەروازەکانی شەفاعەت.. ئەوێ بۆ تۆ دەبێتە خاڵیکردنەوەی دەروونت و، دەتوانی لە گێژاوی ڕابردووت ڕزگارت بێت.. چونکە حەزرەت پەیمانی داوە ئامێز بۆ هەموو ئەوانە بکاتەوە کە بە پەرۆشی و ئیمانەوە دەچنە خزمەتی.. ئەوەشی بۆ ڕوونکردوینەتەوە کە ئەو دوعاو نزایانەی لەو شوێنە پیرۆزە دەکرێن قبوولن.. (إن شاء الله)لەو وڵاتەی ڕەحمەت تاوتاو بەسەریدا دەبارێت، لەو جێگانەی فریشتەکان تێیدا ڕیز دەبەستن، ئەو شوێنانەی دڵەکان تیایدا پاکژ دەبنەوە و چاوەکان تاوی فرمێسکی تێدا دەبارێنن.. وەڵامی هەموو داواو نزاکان دەدرێتەوە.

دادە نیلوفەر، بڕۆ بۆ ئەوێ.. ئەوێ تاکە تروسکەی هیوای تۆیە، شیفای تۆ تەنها لەوێ دەست دەکەوێت.

– بەڵام چۆن؟!

– بیرت نەچێ، پەروەردگار دەروازەی ڕەحمەت بۆ هەموو داوایەکی شایستەو نیازێکی پاك دەکاتەوە.

چاوەکانم داخست.. چوومە خەیاڵی ئەو جیهانەوە، بەڵام لەم کاتەدا ئەو کچە پڕ لە ئومێدو ئاسودەییەم لەبەرچاودا دیارنەما. لەوانەشە ئەو لەوێ بوو بێت، بەڵام من نەمدەبینی و دەنگیم نەدەبیست. بەهۆی خێرا لێدانەکانی دڵم و پەشۆکاویی دەروونمەوە لەوە زیاتر بەرگەم نەگرت.. لەو شوێنەدا لە جێگەی خۆم دانیشتم. بەڵام ئەو پرسیارە وەك گرێیەك وەها بوو لە مێشکمدا.. هەر بیرم لێ دەکردەوە.. چۆن بڕۆم؟!

خودایە بە لوتف و میهرەبانی خۆت لێت دەپاڕێمەوە، ئەو دەروازەی ئومێدە لە منیش بکەرەوە.. لەوکاتەدا هەستم کرد سەرپیل خان بە دەستی ئاماژە بۆ من دەکات.

– دادە نیلوفەر، بینینی تۆ لێرەو لەم پۆشاکە جوانانەتدا چەندە قەشەنگە! هەواڵی هیدایەتی تۆم بیست، لە ڕاستیدا یەکێك لەوانەی پرشنگی ئومێدیان بە من بەخشی، ئێوەبوون. خوا لێت ڕازی بێت.

## پێکەوە دەگریاین:

یەکترمان لە ئامێز گرت.. لەو کاتەدا لە دەریای ئاسودەیی و ئومێدو خۆشحاڵیەوە ورد ورد فرمێسکمان دەڕشت.

دەنگی نزای خانمەکانی دەوروپشتمان بەرز بووەوە:

– خودایە هیدایەت بکەرە نسیبی هەموو لایەك.. ئامین!.

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی جیاواز بوو دەستپێکی قۆناغێکی نوێ بوو لە ژیانمـدا، چـونکە لـەو ڕۆژەدا دەروازەی هیواکـانم دۆزییـەوە کـە دەمێك بوو چاوەڕوانی بووم و، زۆر پێویستم بوو.

کەواتە سـەرفرازبوونم لـە شـەفاعەتی حەزرەتدایـە. بـە زانینـی ئەمەو هەست کردن بەم تروسکایی ئومێدە، ئارامییەکی زۆر سـەیر بـاڵی کێشـا بەسـەر ناخمـدا. بـەجۆرێك دوای چـەند مـانگ ئـەوە یەکەمین جاربوو ئەوەندە هەست بە ئاسوودەیی بکەم. وەك بڵێـی بارستایی شاخێکیان لەسەر شانم لابردبێت.

خودایە.. پەروەردگارم، بە میهرو لـوتفی خـۆت، ئـەو شـەرەفە بکەرە نسیبم... پەروەردگارا، بمکە بە میـوانی ئـەو کـەش و هـەوا ئیمانیی و نوورانییە. بە لوتفی خۆت بمگەیەنـە خزمـەتی حـەزرەت و، دیداری موبارەکی ئەوم بکەرە نسیب.

تارمایی هەڵەکانی ڕابردووم یەخەیان بەرنەئەدام. وا دیاربوو ئەم ژیانەم بەرەو لێژیی و سەختی دەچێت. چونکە گورگە برسیەکانی ژینی ڕابردووم هێشتا منیان لە بیرنەچووبوو. لەڕاستیدا زۆر سەختە ئافرەتێکی تەنیا بتوانێت لە ژیاندا کارو بژێوی خۆی بەڕێوەبەرێت.

هەر لەو کاتەدا کە لە دڵمەوە دەمووت: "هیواکانم زیندوو بوونەوە".. "ڕزگارم بوو" و هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد... ئەو کۆسپە هاتە سەر ڕێگەم.

سەرەتا لە بێزارکردنم بە تەلەفون دەستیان پێ کرد. ئەوانەی کە بازرگانییان بە ئابڕووی مرۆڤەکانەوە دەکرد، بە ناونیشان شوێنی نیشتەجێبوونی منیان دۆزیبۆوە، دیسان دەیان ویست بە فێڵ و هەڕەشەکردن بمبەنەوە ناو ئەو گێژاوەی ڕابردووم.

ئەوەبوو ژمارەی تەلەفونەکەم گۆڕی و بە گواستنەوەم بۆ خانوویەکی تر هەوڵی خۆشاردنەوەم دا. بەڵام بەم هەوڵەش ڕزگارم نەبوو. لەهەمان کاتدا نەمدەویست بارودۆخەکە لە دۆستەکانی دەوروبەرم بگەیەنم و، ئەوانیش گرفتار بکەم. چونکە ئەمانە دەرەنجامی تاوانەکانی ڕابردووی خۆم بوون. بە چ مافێک ڕێگەم بەخۆم بدایە، ئەوانیش بەم گرفتەوە سەرقاڵ بکەم!
لەبەرئەوە هیچ چارەیەکی ترم لەپێشدا نەبوو ئەوە نەبێ بەتەنیا بەرەنگارییان ببمەوە. لەدوای کۆڕەکەی ڕۆژی یەکشەممە، بە

بینینی نامەیەك لە سندوقی پۆستەكەم بەتەواوی ترس دایگرتم.. لەڕاستیدا ترسم لە مردنم نەبوو.. ترسم لەوە بوو بكەومەوە دەستی ئەو ئابڕو بەرانەو تەواوی بوونم بڕوخێنن.

"ئەمە دواهەمین و تاكە هەڵبژاردنتە" دەستپێكی ئەو نامەیە بوو... "چەند پارە داوا بكەیت، چ ژیانێكی خۆشگوزەرانت بوێت، هەروەها بەخواستی خۆت شوێن و جێگە هەڵبژێرە... بیرت نەچێت، تۆ بۆ ئێمە پێویستی، دەزانیت ئەگەر وەڵامت "نەخێر" بێت. ناتكوژین، بەڵام دڵنیابە بەدواتەوەین".

تووشی شۆك بووم و، نەمدەزانی دەبێت چی بكەم..! ئەم پیاوانە هەركاتێك شتێكیان خستبێتە مێشكیانەوە بێ دوودڵی ئەنجامیان داوە. خۆزگە كاتی خۆی كۆتاییان بە ژیانم دەهێنا.

ئەوان هەركاتێك مەبەستی خۆیان پێكابێت، لە سوچێكدا كەسەكە فڕێ دەدەن و بە مردوویی بەجێی دەهێڵن.

ئاه.. خۆزگە دەكرا بمرم... لەڕاستیدا مردن جوانترین نیعمەت بوو بۆ من لەم كاتەدا. ئەوان كەسانێك نەبوون لە هیچ بترسن.. بۆیە لەم تەنهایی و بێ چارەییەمدا تەنها پەنام بۆ خوای گەورە برد. بزانم قەدەری خودا چی تێدایە؟! خۆ ئەگەر دیسان تووشی بێ چارەیی ببمەوە، ئەمە سەرەنجامی چاوەڕوانكراوی ڕابردووی خۆم بووە. كەواتە بۆئەوەی باجی هەڵەكانی ڕابردووم بدەم، پێویستم بە چەندان مانگ و سالی تر هەیە لە شكستخواردن و

ترس و سووتانی بێدەنگانە. بەڵام تەنها شتێك كە ئاسوودەیی و ئارامی پێ دەبەخشیم، ئەوە بوو كە:

لەمەودوا بە هیچ جۆرێك بە ویستی خۆم ناچمەوە سەر ئەو ڕێگە شەرمەزارانەیە.. إن شاء الله.. دڵنیاشم پەروەردگار من ناداتەوە دەست بێ بەزەیی ئەوان.

هەر لەم نێوەندەدا ئاگرێكی هەڵگیرساویش لە ناخمدا كڵپەی سەندبوو و، بۆم خامۆش نەدەكرا.. ئەویش: ئەگەر تەمەن ڕێگەم نەدا بچمە خزمەتی حەزرەت؟ ئەی ئەگەر فریای یەك جارو یەك هەناسە لەو كەشە پڕ میهرەی ئەوێ نەكەوم؟!.. نەتوانم ئەو كاتە ببینم كە لە خزمەتی حەزرەتدا بە پەرۆشیەوە بڵێم:

"سەروەرم.. بەندەیەكی تاوانبار لە ئوممەتەكەت هاتووەو، خوازیاری شەفاعەتی تۆیە.."

بەڵێ.. ئەوەی بەتەواوی خەیاڵمی داگیركردبوو ئەم پرسە بوو.

پەروەردگارم تكات لێ دەكەم، لە چنگی ناپاكی ئەوان بمپارێزە.. پارێزراوم بكە لە فێڵ و پلانە ناپاكەكانیان، هەر خۆت خاوەنی بێ چارەكانیت، خودایە حاڵی بێچارەیی خۆم تەنها بەرەو لای مەملەكەتی میهرت هێناوە.

تەمی خەمێكی بێ ئەندازە تەواوی بوونمی داگرتبوو.. بەجۆرێك هیچ شتێك لەم گەردوونەدا نەبوو جگە لە زاتی (الله) ئارامیم پێ ببەخشێت، چونكە بە تەواوی ئارامیم شێوابوو،

نەمدەتوانی بە هیچ جۆرێك پشوویەك بدەم.. دەتوت دەستێكی نادیار چنگی كردووە بە هەموو هۆكارەكانی ئاسوودەیمداو لەیەك ساتدا هەزاران چەقۆ دەروونم پارچە پارچە دەكەن.

لەڕاستیدا ئەم دۆخە نائارام و پڕ لە مۆتەكەیەشم، پێشەكی هەواڵدەری هاتنی بەڵایەك بوو.

لەگەڵ ئەمەشدا خۆم هیچ گومانێكم لەم بابەتە نەبوو.

## نامەوێ بگەڕێمەوە هەمان ڕێگەی ژیانی ڕابردووم:

ئەو شەوەش تا بەرەبەیان لەسەر بەرماڵەكەم دەستم بەرز كردبۆوەو هاوارو پەنام بردبوویە پەروەردگارم. دێڕەكانی (جەوشەن)[1] ەكەی دەستیشم بە بارانی ئەسرینەكانم ئاودەدان... بەرەبەیان بۆ یەك چركەش و بێ وچان نەخەوتم.

لە ماڵەكەمدا بەتەنها دەژیام. بەپێی پێویست ڕێوشوێنی خۆپاراستنم گرتبووە بەر، بەڵام كاتێك كەسانێكی بێ ویژدان بەدواتەوەن، هەرگیز ناتوانیت دڵنیابیت لە سەلامەتی و ڕزگاربوونت. لەڕاستیدا ئەتوانم بڵێم ئەوە یەكەمین جاربوو لە

---

١- جەوشەن: مەبەست ئەو موناجاتە ڕەنگینەی پێغەمبەرە ﷺ كە بە ڕیوایەتی (زەینولعابدین) (خوای لێ ڕازی بێت) دەماودەم ڕیوایەت كراوەو، لاڵانەوەو موناجاتێكە بە سیفاتە مەزن و ناوە جوانەكانی خوای گەورەو، لەنێوان هەموو بڕگەیەكیدا ئەم دەستەواژەیە دووپات دەبێتەوە: (سبحانك لا إله إلا أنت الأمان الأمان أجرنا من النار.. خلصنا من النار.. نجنا من النار).

ژیانمـدا ئەوەنـدە هەسـت بـە تـەنهایی و بـێ دەسـەڵاتی و بـێ هاودەمیم کردبێت.

ئـاه سـەیدا ئـاه! چـی دەبـوو ئەگـەر ترپـەی خۆشەویسـتی و هەستی پاکی منت ببیستایە. چی دەبوو ئەگەر لە مەبەستی پاکی مـن تێبگەیشـتیتایە. خۆزگـە گوێبیسـتی سـەدای هانـابردن و بـێ کەسی منت دەبیست و بەهانای بێچارەییەکەمەوە دەهاتیت..

من تەنها مەبەستم هاوسەرگیرییەکی سادەو پـڕ لـە میهرەبـانی بوو. ڕازیـم بـەوەی تـەنها پەسـەندم بکـەیت و، وەك درەختێـك لـە سایەی پارێزگاری و میهرەبـانی خۆتـدا جێگەیـەکم بـۆ بکەیتـەوە، لەڕاستیدا بۆ من کە ناوی تۆ هەڵبگرم ئەوپەڕی خواستم بوو.

لە هەفتەیەکدا ئەگەر بۆ یـەکجاریش بـووە، گوێبیسـتی دەنگـی پڕ ئامۆژگاری و وشە پـڕ ئـەدەب و بـەڕێزەکانت دەبـووم. دڵنیابـە لەمـە زیـاترم داوا نـەدەکرد! بـەڵام لـەدوای ئـەو هـەموو تـاوان و لادانـەم، نـەدەکرا تەنانـەت بـە هیوایـەکی کزیشـەوە چـاوەڕوانی هەڵوێسـتی ئـەو بکـەم. بەتاییـەت پـاش کۆچـی دوایـی هاوسـەرە شایستەو قەشەنگ و میهرەبانەکەی.

لەڕاستیدا مرۆڤ ناتوانێـت ئـەو کەسـانە هەڵبـژێرێت کـە خۆشـی دەوێن... تەنها ئەوەی لە توانادایە بە هەڵبـژاردنی دڵ قایـل بێـت، چونکە دڵ گوێ بۆ ڕێنموییەکانی ژیری ناگرێت و، بڕیـاری کۆتـایی هەر لای ئەو دەبێت. بۆ ئەو ژیانـەی ڕابـردووم کـە هـەموو بـوونمی

لەناو برد.. چەندین جار بیرم لەوە کردووەتەوە، ئەگەر ئەوەندە شەیدای جوانیی و، ویستی بەدەستهێنانی ناوبانگ بەم ڕۆژەی نەگەیاندمایە، لەوانەبوو منیش وەك نورای خان لە خانۆچکەیەکی بچووکداو، لەسایەی خۆشەویستی هاوسەر و منداڵەکانمدا بژیامایە. ڕەنگە تەنانەت لەسایەی سەیداوە وەك بەختەوەرترین ئافرەتی دنیا ژیانم بەڕێ بکردایە.

بەڵام ئەویش ڕۆیشتو.. هەموو ئەمانە جگە لە خەیاڵێك هیچی تر نین... بەڵام لەم دۆخەشدا، بوونی سەیدا لە ژیانمدا بەردەوام وەك شنەبایەکی بەهار ژیانمی فێنك دەکردەوە.

## دەنگی سەیدا لەهۆش خۆمی بردم:

لە میانەی ئەم بیرکردنەوانەماندا بووم، کە دەنگی تەلەفۆن بە ئاگای هێنامەوە. لەناکاو ئەو دەنگە ڕایچڵەکاندم.. تۆ بڵێی دیسان ئەوان بن، لەڕاستیدا دوودڵ بووم، ئایا وەڵام بدەمەوە یان نا؟! بەڵام هەرچۆنێك بوو دەستم دایە ئامێری تەلەفونەکە.

– نیلوفەر خان!!

ئای خوایە.. خۆ ئەوە سەیدایە!.. خۆیەتی، ئەو دەنگەیە کە ئارامی بە دەروونی مرۆڤەکان دەدات، بەڵام کتوپڕ پێشهاتەکە منی شپرزە کرد. بەجۆرێك هەموو هێزی لێ سەندم و هیچم پێ نەوترا.

– خێرە، نەخۆشیت؟

- نا نا.. من زۆر باشم.

- دەنگت باش نیە!

- تەلەفۆنەکەت کتوپڕ بوو.. چاوەڕوانم نەدەکرد.. لەبەرئەوە بوو...

- دەنگوباست چۆنە؟

سەدای دەنگە پڕ میهرەبانی و ئەدەبەکەی دیسان وەك ئەفسانە خستمیە ژێر کاریگەری خۆیەوە.. دیارە تا ئێستا منی لەبیر نەکردوە. ئەو خەیاڵە زۆر دوورەی من ڕاست دەرچوو بوو! بە پەرۆشەوە وتم:

- من باشم .. ئەی ئێوە؟

- زۆر سوپاس بۆ خوای گەورە، بەردەوامین لە پاراستنی ئەمانەتەکەی پەروەردگار.

بەڵێ، سەیدا کەسێکی زۆر جیاواز بوو.. سەراپای دنیای ئەو بریتی بوو لە کارکردن و خزمەت کردنی ئیمانەکەی. بەرنامەکانی ڕۆژانەی بریتی بوو لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی بەندایەتی و، یارمەتیدانی لێقەوماوان و دەستگیرۆیی کردنی ئەو کەسانەی کە ڕاستی ژیانی دونیایان لەکیس دابوو.

ئەو بەردوام بوو:

- بۆ ئەوە پەیوەندم پێوە کردیت، لە خەونمدا تۆم بینی. کە لە تێکۆشانێکی قورسدا بوویت و، هاوارت دەکرد: "کەسێك هەیە

یارمەتیم بدات؟!" لەڕاستیدا زۆر نیگەران بووم. خۆ هیچ بەڵایەك ڕووی نەداوە؟!.

دڵم بە توندی و خێرایی لێی دەدا.. تەزوویەك بە لەشەمدا هات.. بیری خەیاڵەکانی قۆناغی گەنجێتیم کەوتەوە. کەواتە سەیدا بیری لە من دەکردەوە ها؟! واتە دڵی ئەویش لای من بووە، ئەوەتا خەوی پێوە بینیوم..! خودایە گیان، تۆ بڵێی ئەم پێشبینیەم ڕاست دەرچێت. یان ئەوەتا ئەم ئومێدەشم وەك ئەوانی تر خامۆش دەبێت.

- نا.. نا.. من هیچم نیە..

ناچار بووم ڕاستیەکەی پێ نەڵێم. نەمدەتوانی و بەرگەی ئەوەم نەدەگرت، ئەو لە مەیدانی ئەو بێ ویژدانانەدا ببینم و زیانی پێ بگات.

- نیلوفەر لە بیرت نەچێت..! تۆ خوشکێکی بەڕێزی منیت. لەکاتی ناخۆشی و ناهەمواریدا بزانە کە هەمیشە دەرگایەك هەیە لێی بدەیت. بە وتنی (ئێوارەیەکی شاد). تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

## دیسان کۆشکی هیوام ڕووخا:

ئەو تەنانەت بێ ئەوەی خۆی هەست بکات سەراپای کۆشکی هیواکانمی ڕووخاند، ئەمەش کاتێك پێی وتم: "تۆ خوشکی منیت"..

بەڵام ڕستەی "لەکاتی ناخۆشی و ناهەمواریدا، بزانە هەمیشە دەرگایەك هەیە لێی بدەیت" تروسکاییەکی هیوای بە دڵی مرۆڤ دەبەخشی. واتە دیسان دەبوو ئومێدەکانم بە ئەگەرێکی زۆر زۆر دوورەوە گرێ بدەم. ئەمەش وەك بەرەنگاربوونەوەیەك بوو لەگەڵ ئەستەمەکاندا.

ڕۆژێکی دیکەش کلۆرو دانیشتنمان هەبوو. منیش بۆئەوەی زوو بگەمە ئەو کەشە ڕۆحانی و پڕ نوورە، هەر زوو خۆم ئامادە کرد. باسی ئەو ڕۆژە جۆش و خرۆشێکی جیاوازی بە مرۆڤ دەدا. لەگەڵ خوشکە فریشتەئاساکاندا گوێبیستی باسێك بووین لەسەر وەسوەسە. ئەم بابەتە زۆر گرنگ بوو، چونکە شەیتان بۆ دوورخستنەوەی مرۆڤ لە پەرستش و بەندایەتییەکانی وەسوەسەو گومانی جۆراوجۆر لە ئەقڵ و دڵی مرۆڤەکاندا وێنا دەکات. ئەگەر هۆکارو چارەسەری ئەمە نەزانرێت، ئەوا ڕەنگە مرۆڤ بەرەو دۆخێکی وەها بەرێت کە تەنانەت ئەنجامدانی پەرستشەکان پشتگوێ بخات.. بۆ ئەوەی باشتر لە گفتوگۆکان بگەم، کتێبی "وتەکان"م بەدەستەوە گرت و، بەخێرایی چاوێکم خشاند بەسەر باسی "وەسوەسە"دا، وتم با کەمێك زانیاریم لەسەر بابەتەکە هەبێت.ئەگەر قەبارەی وەسوەسە بچووك ببینرێت ئەوا بێگومان کاریگەرییەکەیشی بچووك دەبێتەوە، هەروەك ئەگەر گەورە ببینرێت کاریگەرییەکەیشی قورس و سەنگین دەبێت. سەرەتاش

شەیتان گومانێك لەناو دڵدا دەنێژێت، خۆ ئەگەر لەدڵدا گەشەی نەکرد، ئەوا بە شێواندنی خەیاڵەکانی، مرۆڤ دەخاتە گێژاوەوەو وای لێدەکات لە ژیانی خۆی ناڕازی بێت.

وا لە مرۆڤ دەکات بیەوێت لەخودی خۆی و بیرکردنەوەکانی هەڵبێت.. زۆرجار مرۆڤ هەڵدەداتە ناو باوەشی تاریکستانی گومانەکانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها مەبەستی بەلاڕێ بردنی مرۆڤ نییە، بەڵکو بەرەو هەڵدێربردن و بێ دین کردنیشیەتی.

چرپەکانی شەیتان لەناو دڵیدا ڕەگ دادەکوتن و بەرەو بازاڕی ژیانی دونیای دەبەن. لە ڕاستیدا مەبەستی شەیتانیش هەر ئەمەیە.

کاتێك شەیتان تایبەتمەندیەکانی مرۆڤ دەکرێتەوە، لە بەرامبەردا بە مەبەستە شەیتانییەکانی خۆی دڵەکان جەنجاڵ دەکات. ئەوانە دەرگاکانی شەیتانن. ئەرکی مرۆڤیش ئەوەیە هەمیشە وریاو بە ئاگابێت، هیچ بەشێکی ژیانی بە بەتاڵی ناهێڵێتەوە، بەڵکو کاتەکانی ژیانی بە یادی خواو بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی و سوپاسگوزاری و کاری باشەوە بەسەر ببات، چونکە ئەگەر وا نەکات، شەیتان هزرو بیرو ڕازەکانی پڕ دەکات لە ناپاکی. هەر لەم کاتەدا مرۆڤەکە هەست دەکات قورساییەکی زۆر لەسەر دڵی کەڵەکە بووە.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، هەروەك چۆن هەرگیز ناتوانرێ پەی بە هەندێك شتی ئەم گەردوونە ببرێت لەلایەن مرۆڤەوە، شەیتانەکانیش ناتوانن زیان بە مرۆڤ بگەیەنن. چونکە مرۆڤ دەتوانێ لە پەنجەرەیەکی خۆلاییشەوە ئاسمانی شین ببینێت و، بەم هەوڵانەی شەیتانی هەوا بە ئاسانی تلکەوێتە تاوەوە. نابێت مرۆڤێك کە وەسوەسە کەوتە خەیاڵیەوە بڵێت: "ئەی هاوار چەندێك لە هەڵدێردا ڕۆچووم!" بەڵکو باشتر وایە دەستبەجێ خەیاڵەکانی یا باشە بگۆڕێت.

هەروەها ئەگەر بەدەست ئەو وەسوەسانەوە ئازار بچێژێت، ئەمە شتێکە لە دەسەڵاتی خۆیدا نییەو، نابێت زۆر بە قورسی سزای دەروونی بدات، بەڵام ئەگەر بە دروستبوونی ئەو وەسوەسانە لە ناخیدا هەڵوێستێکی نەبێت، ئەوا ئەمەیان لە دەستی خۆیدایە، کە بێ ئاگایانە دەکەوێتە ناو ئەو بۆسەیەی شەیتان بۆی چنیوە.. بەئەرمسیار دەبێت و پێویستە تەوبەی لەسەر بکات.

زۆر دەترسام:

کتێبەکەم خستە ناو جانتاکەم و، لەو بیتایەی تێیدا نیشتەجێ بووم هاتمە خوارەوە بە هیچ جۆرێك نەمدەتوانی ترسی خەیاڵی فڕاندنم لە مێشکم دەرکەم.

لەڕاستیدا ئەوە بۆ یەکەم جار بوو، ئاوا بە چاونەترسیەکی زۆرەوە و بەتەنها بەرەو ئەوماڵەی تیایدا کۆدەبوینەوە -کە زۆریش دوور نەبوو- چووم.

هەموو شت ئاسایی دەهاتە پێش چاو، بەڵام لەو ناڕەحەتی و پەرۆشیەی ناخمی دەخوارد تێنەدەگەیشتم. بۆ ئەوەندە گومانی خراپ دەهات بە خەیاڵمداو ئەم مۆتەکانە خەریك بوو بە تەواوی هێزیان پێ نەدەهێشتم.

لەم کاتەدا ئەو ڕاوچییانەی مرۆڤ کە هەموو بوونمیان لێ سەندمەوە، لە پشت سەرمەوە بوون و چاودێرییان کردبووم.

دەیان ویست سەرلەنوێ بەزۆر بمخەنەوە ناو ئەو زۆنگاوەوەو، بمکەنەوە نێچیری چنگی ئامانجە گڵاوەکانیان، لە دەروونیاندا تەنانەت تنۆکێکیش لە میهرەبانی و بەزەیی و ویژدان بەدی نەدەکرا. میهرەبانی و ڕەحم و ویژدان نەدەبینرا. ئەوەی لای ئەوان گرنگ بوو تەنها مامەڵەکردن بوو بە مرۆڤەکان و ئابڕوویانەوە. ئەو گورگە برسیانە مامەڵەیان بە تەمەنی گەنجەکانەوە دەکردو، لەکۆتاییشدا لە کەنارێکدا بەجێیان دەهێشتن بۆ نادیار. هیچ کام لەمانەش ئەوەندەیان هێزو بوێری پێ نەمابوو تا پارێزگاری لەخۆیان بکەن، یاخود هەموو بوونیان بەفیڕۆ درابوو، لەبەرئەوە، ئەم گەڕانەوەیەی من بۆ باوەڕەکەم و، بالاپۆشیم و، ئەوەی کە دەمەوێت لە سوچێکدا لەگەڵ خوای خۆم

پاشماوەی تەمەنم بەڕێ بکەم، بۆ ئەوان هیچ نرخ و گرنگییەکی نەبوو، بەڵکو ئەوەی بەلای ئەوانەوە گرنگ بوو، ئەوە بوو کە من هێشتا سەلامەتم و تەندروستیم زۆرباشەو دەتوانن مامەڵە بە ئابڕوومەوە بکەن.

دەمزانی بەڵایەك لە پشت ئەو هەڕەشانەیانەوە خۆی حەشارداوە، دەمزانی بێ ویژدانی ئەو مرۆڤە دڕندانە لە چ ئاستێکدایە، بۆم دەرکەوت لە دنیا ساختەکەیاندا، سەرەتا بەناوبانگت دەکەن و، دواتر تا دوا ساتی تەمەنت دەبیتە دیلی خواستەکانیان...

پەروەردگارا، لێت دەپاڕێمەوە، مەهێڵە دیسان ئەم بەندە تاوانبارەت نوقمی گێژاوی ئەو ژیانە بێت، خودایە، بمپارێزە لەوەی ببمە خۆراکی ئەو جانەوەرە برسی و دڕندانە. خودایە، باوەڕە پاك و دڵسۆزانەکەم پارێزراو بکەیت و، ئەو خۆشەویستییەی بۆ زاتی سەروەری خۆشەویستم لەدڵمدا ڕواوە بێتە بەرهەم، چونکە من هەر بە خەیاڵی دیداری ئەوەوە دەژیم. ئومێدی گەیشتن بە حزووری ئەوە کە هێزی خۆڕاگریم پێ دەبەخشێت. هیوام بە شەفاعەتی ئەوە کە هێزی بەردەوامیم پێ دەبەخشێت.

منیان ڕفاند.

خودایە ژیانی من لەم دنیا تاڵەبارەدا نا، بەڵکو لەو دنیا نوورانیانەدا کۆتایی پێ بهێنە.

چەندە سوڕامەوە، نازانم.. چەندە ڕۆیشتم، ئەوەش نازانم.. ئەوەی دەمزانی تەنها ئەو خەیاڵە بوو کە چۆن بتوانم ئەو ترس و دڵەڕاوکێیانەی ناخم بڕەوێنمەوە، پەنام بۆ خوا بەرم. ئەوەبوو خەریک بووم لەو هەژانەی ڕۆحەم خۆم ڕزگار دەکرد، لە ناکاو لە نزیکمەوە مارسیدسێکی تەکسی وەستاو، لەیەک کاتدا هەر چوار دەرگای کرایەوەو، نازانم دوای دابەزینی ئەو چوار کەسە چی ڕوویدا، هەر ئەوەندەم زانی خۆم لەناو تەکسیەکەدا بینییەوە.

دەستبەجێ لەویادا لەهۆش خۆم چووم. تای چەندە ساتەوەختێکی تاڵ و گران بوو، چەندە پێشهاتێکی کتوپڕ بوو. ئیتر لەوێدا بە تەواوی هەستم بە ڕووخانی کۆشکی هیواو خۆشەویستی و خەونەکانم کرد.

من لە هەرێک دەچووم کاتی بۆ سەربڕینی دەبەن. بەڵام خۆزگە وەک ئەو پاک و بێتاوان دەبووم. لەڕاستیدا من خۆم زۆر باش لەو دنیا درندانەو بێ بەزەیی و پڕ لە تاوانەی ئەوان شارەزا بووم.

نازانم چەندە تکام لێ کردن، چەندە پاڕامەوە، چەندە قاچ و دەستم ماچ کردن.

بیکەسم، بەڵام بەندەی خودام شلە نابەم کە یارمەتیم بدات. دەمبەن.. دەمبەن بەرەو ئەو زەلکاوانەی هیچ خشتێکی زیندووی تێدا ناژی. بەرەو ئەو دنیایەی کە هیچ و ئومێدو خەونەکانم تێیدا ناشت.

خودایە، فریام بکەوە.. جگە لە تۆ هێزێکی تر نیە، کەسێکی تر شلە نابەم.

هاوارم دەکرد بەسەر ئەو بکوژە بڵێرەق و ویژدان مردوو و ڕووخسار داپۆشراوانەی تەنیشتمدا.

– "تەریق ببنەوە.. ئێوە دایك و خوشكتان نیە؟ دڵۆپێك لە میهرەبانی شلە دەیبەن؟ مانای بەرەبەیی دەزانن؟ چی دەبێت ئەگەر بڵێن منداڵن هەڵزڕیوەتەوەو، منداڵن نەبیوە، وازم لێبێنن".

بەڵام ئەمانەم هەمووی لەخۆڕایی دەوت، دەنگ لە بەردەمە دەمات، لەوانەوە نەدەمات.

چیتر هیوایەکم بۆ گەڕانەوەو ڕزگاربوون نەدەکرد.. هێشتا لە تاوانەکانی پێشووم ڕزگارم نەبووە، وا دیسیان دەکەومەوە هەمان زەلکاو.

بەهۆی ئەوەی زۆر هاوارم کرد، دەم و چاویان داپۆشیم، دوای ئەوەی بۆنێکی سەیرم کرد، لەهۆش خۆم چووم.

کە چاوم کردەوە. لە حەوشەیەکدا خۆم بینییەوە، دیواری بەرز بوو و، بە پلیکانەیەکی بەرزدا سەردەخرام. دواتر لە هۆڵێکی

دلخراودا کە لـە جوانیـدا چـاوی دەبـردو، ئـاڵو واڵاو گرانبـەها بـوو منیان بەجێ هێشت.

بەتەواوی تووشی شۆك بوو بووم. هەم ئەو خانووەو، هـەم ئـەو سیمایانەی بینیم نەمناسینەوە. ئێرە جێیەکی زۆر نـامۆ بـوو. لـەو دەورووبەرەشدا یەك دوو خانمی پێگەیشتووی خانەدانم بینی. هـەم لە ڕووی تەمـەنیان و هـەم لـە ڕووی پۆشاکیشـیان لـە خانمـانێکی بێچـارە نەدەچـوون. ئێـرە جگـە لـەوەی جێـی بازرگـانی کردنـی ئافرەتان بوو، لەوەش دەچوو بۆ تەماشای ئەو خـانووە سـەردانی بکرێت.

بەم خەیاڵانە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووە ئەو پەشۆکاوی و نائارامی و هەناسـەبڕکێیەم تۆزێك کـەم بـووەوە. تەنانـەت ئـەم گومانانەم لەلا بوویووە ئومێدی گەورە.

بـەردەوام نـاوی خـودای گـەورەم دەهێنـا.. ڕزگـارم بکـە لـەم زەلکاوە، یان هەر ئێستا لێرە گیانم بکێشە.

ئەم پاڕانەوەوە و هانـا بردنانـەم بەوپـەڕی توانامـەوە دووبـارە دەکـردەوە، بـەجۆرێك هەسـتم دەکـرد دڵـم لـە لێـدانی توونديـدا خەریکە لە سینەم دێتە دەرەوە. لەوانەشە ئەمە بەهۆی پەرۆشـیم بێت بە ئومێدێکی کزو لاواز.

ئێرە شوێنێکی نامۆ بوو،

زۆری نەخایاند پیاوێکی باڵابەرزی ئەسمەر، کە وا دەردەکەوت زۆر دڵنیاو باوەڕی بەخۆی هەیە هات و وتی:

– "نیلوفەر خان، بەخێرهاتی".

منیش بە سەیرکردن و نیگاکانم تێم گەیاند "ئەمە چ جۆرە بەخێرهاتنێکە؟!".

– "دەزانم .. ئەم جۆرە هاتنە هیچ مایەی خۆشحاڵی نیە.. حەق بە تۆیە".

لەبەرامبەرم دانیشت. پاش کەمێك خانمێك کە لە هاوتەمەنی پیاوەکە دەهاتە پێش چاو، کەمێك داپۆشراو و قەشەنگ بوو، هات و لە تەنیشتی دانیشت. پێی ناساندم:

– "هاوسەرەکەم .. ئارەزوو". منیش بێ هیچ وەڵامێك هەوڵم دەدا بەو هەستە سەرلێشێواوانەوە بەسەر هەڵچوونەکانمدا زاڵ ببم. لە خەیاڵی ئەوەدا بووم ئەم حاڵە بەچی دەگات و، ئەنجامەکەی چی دەبێت.

– "خۆ پیاوەکان ڕەفتاری نابەجێیان لەگەڵ نەنواندوویت؟!".

بە دەنگێکی بەرزو ناڕازییەوە هاوارم کرد:

– "من بۆ لێرەم؟!"

ئەویش بە دەنگێکی کەمێك بەرز وتی:

- "سەرەتا دەمەوێ بزانن بۆ مەبەستێکی خراپ نەهێنراونەتە ئێرە، دەمەوێ دڵنیاش بن لەوەی بە هیچ جۆرێك دەست لە ئێوە نادرێت".

ئەم ڕستەیەی کۆتایی وەکو زەنگێك لەگوێمدا دەزرینگایەوە. کەواتە دەبێ پێم خۆش بێت! یان لەمۆش خۆم بچم؟! یاخود بکەومە سەر دەست و قاچیان و لێیان بپاڕێمەوە؟!

وەك بڵێی خوای گەورە لەناکاو لە ئەشکەنجەی ئەو دۆزەخەی دەروونم ڕزگاری کردم. بۆیە لەبەرخۆمەوە هەر دەموت:"شکور بۆ تۆ خودایە".

بێ ئەوەی من بپرسم، وتی:

- "دەزانم .. لەوانەیە بڵێیت:"مادام بۆ مەبەستێکی خراپ نەهێنراوم، کەواتە لێرە چی دەکەم؟! نەدەکرا بە شێوەیەکی ناسکتر بانگهێشت بکرامایە! بە نیگایەك کە مانای "بەڵێ"ی تیابوو سەیرم کرد. نیگایەکی پڕ حەسرەت.

- "لەبەرئەوەی دڵنیابووین بەخواستی خۆت هەرگیز نایەیت، بەناچاری ئەم ڕێگایەمان گرتە بەر".

- "بۆچی؟!"

ئەمەم بەجۆرێك وت کە بمەوێ لە نهێنی ئەو پلانەیان تێبگەم.

- "چییە نیلوفەر خان، ئارام بن. وەڵامی ئەم پرسیارانەتان دەست دەکەوێت. دواتر ئەوەتان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە هەرگیز

بۆ ئازاردان تۆمان نەهێناوە. لەبەرئەوە کەمێك ئارامتان هەبێت و پشوو درێژبن. بەڵام بێگومان مرۆڤ لەو بارودۆخانەدا چۆن دەتوانێت ئارام بێت.

- "بۆچی ئێوە نەبوون؟ ئەوەی هەڕەشەی لە من دەکرد و، ئەو نامانەی دەنارد؟"

- "بەداخەوەم نیلوفەر خان. ئەمە لەوانەیە کاری پیاوەکانی تر بووبێت. ئەو پلانە یەك دوو ڕۆژ بەر لە ئێستا وەستێنرا، ئێوە بەو نیەتەوە نەهێنراونەتە ئێرە، بەڵکو وەکو میوانێکی بەڕێز هاتوون".

پێویستە ئاغا ببینین،

هەستایە سەرپێ:

- "ئارەزوو.. بۆی باس بکە، پاش کەمێکی تریش دەچینە لای ئاغا.

(ئاغا)؟!... ئەمە ئەو ستەمکارەیە!.. ئەو بێ ویژدانەی مامەڵە بە ئافرەتەوە دەکات!.. سەردەستەی سەدان درندەی وەك خۆیەتی.. ئەو بێ بەزەییەی ژیانمی شێواند، گەنجێتیمی هەڵوەراند و کۆشکی ئومێدەکانمی ڕووخاند.

دەمەوێ بە دەستەکانی خۆم بیخنکێنم... دەمویست بە چەقۆیەك پارچە پارچەی بکەم. دەمویست بەناوی هەموو ئەو

کچانەوە کە ئابڕوویان فرۆشرابوو و، وەك گوڵێکی وشك بوو لە سوچێکی ئەم ژیانەدا فڕێی دابوون، پارچە پارچەی بکەم.

دووبارە لەهۆش خۆم چووم.. بە بیستنی ناوی ئەو بکوژە، ئەو بازرگانی ناموسە چۆن لەهۆش خۆم نەچم!! مەگەر ئەو نەبوو ئێمەی لە بازاڕی ئەو ژیانەدا هەرزان فرۆش کرد، خەیاڵ و ئومێدەکانمانی ناشت. ئێمەی کردە مایەی حەسرەت بۆ خانەوادەکانمان.

بەدەم گریانەوە لەناو ئەو هۆڵە کەوتم. چۆن بەرگەم بگرتایە دوای بیستنی ئەو ناوە؟!

ئارەزوو خان هات دەستی گرتم و بەرزی کردمەوەو پەرداخێك ئاوی پێدام. ئەو بە چاوە میهرەبان و بەسۆزو شیرینەکانی سەیری دەکردم!

- "نیلوفەر خان.. من بۆ یەکەمین جارمە تۆ دەبینم. بەڵام ناوتم زۆر بیستووە. منیش یەکێکم لە قوربانیەکانی ئەو ژینی شەرمەزارییە، بەڵام ئێستا بارودۆخەکە گۆڕاوە، تۆ بۆ مەبەستێکی جیاواز بانگ کراویتە ئێرە. با بچینە لای (ئاغا) خۆت لەمە تێدەگەیت.. تەنانەت ڕەنگە زۆر زۆریش سەرت بسوڕمێ.

چی دەبێت کەمێك ئارام بگرن، لانی کەم باوەڕت بە من هەبێ".

- "ئەو پیاوەی ئێستا کێ بوو؟".

- "هاوسەری من بوو. لە دوو ساڵ لەمەویەرەوە دەستە ڕاستی ئاغایە".

خودایە ئەمە چ جۆرە دۆخێك بوو؟! لە هیچ تێنەدەگەیشتم. هەموو شتەکان زۆر نامۆو تەماوی بوون. منیش وەکو ڕێبوارێك بووم کە ئاڕاستەی گەشتەکەی ون کردوە.

هەزاران لێکدانەوە بە مێشکمدا دەهاتن. هەزاران گومان و نومێدو ترس خەیاڵمیان ئاڵۆز کردبوو. وەك مرۆڤێکی ڕووخاو و شکستخواردو و پەشۆکاو دەهاتمە پێش چاو.

لەو ساتەوەختەدا سەرپیل خان خۆی کرد بە هۆڵەکەدا.. ئەو بە بالاپۆشییە سەرنجڕاکێش و میهرەبانانەکەیەوە... ئەو خۆ داپۆشینەشی چەندە لێ هاتبوو! بەو درەوشاوەییەیەوە لەگەڵ فریشتەکان جیا نەدەکرایەوە.

هەردووکمان بە پەرۆشییەوە یەکمان لە ئامێز گرت:

- "دادە نیلوفەر".

- "سەرپیلی خوشکم".

بە ترس و جۆش و خرۆشییەوە یەکترمان لە ئامێز گرتبوو.

پێش ئەوەی من فریا بکەوم بپرسم، سەرپیل بە پوختی هەموو شتێکی بۆ باسکردم:

- "منیان بەزۆر هێنایە ئێرە.. پێش ئێمەش کۆمەڵێکی تریان هێناوەو ناردویانن بۆ بینینی ئاغا. بەڵێنیان پێداوین کە بە نیازی

خراپ مامەڵەیان لەگەڵ نەکەن، بەلام مێشکم ئاڵۆزبووەو، زۆر دەترسم، بەم شێوەیە جیایان کردمەوە لە دنیایەك کە بۆ یەکەمین جار هەستم بە دڵنیایی و ئاسودەیی کردبوو تێیدا."

ویستی ئاغایە:

هەمان شت بوو.. ترس و دوودڵی هەردووکمان هەمان شت بوو، بەلام ئومێدمان لە خوای گەورە نەبڕابوو. ئەو بێ ئاگا لێبوونی بەندەکەیشی، لە ئەنجامدانی خراپەکان پارێزراو دەکات.

وتیان:"ئاغا دەیەوێت بتانبینێت" ئێمەیان بردە نهۆمی سەرووتر. لەو کاتەدا لەگەڵ دوو خانمی قەشەنگی تر ڕووبەڕوو بووینەوە، کە ئەوان دەهاتنە خوارەوە. وا دیاربوو ئەم خانمانە بۆ دنیا ناپاکەکەی ئاغا ئامادەکران.

بەلام بۆچی؟ لەم کاتەدا بیرم لەمە دەکردەوە.

گەشتینە نهۆمی سەرووتر. لەگەڵ سەرپیل خان هاوشانی یەکتری دەڕۆیشتین. لەدواشمانەوە ئارەزووخان و هاوسەرەکەی دەهاتنە سەرەوە.

دووبارە چووینە ژوورێکەوە کە دیکۆرێکی زۆر سەرنج ڕاکێشی هەبوو. لەوکاتەدا پیاوێکی زۆر ڕێك پۆش و، نووورانی هات و، بەپەلە بردیانە ژوورەکەی تەنیشت. پاش کەمێك پزیشکێك بە جانتاکەی دەستیەوە هاتەدەر.

لەراستیدا ئێمە لەم پێشهاتانە سەرمان دەرنەدەکرد. بەهەرحاڵ لەو ژوورەی تەنیشت، ئەو "ئاغا"یە، ئەو زاڵمەی لێ بوو، بەڵام پزیشکەکە و ئەوانەی کە ئێمەیان بەڕێزەوە بانگ کرد.. هەموو ئەمانە وای کردبوو لە مێشکمدا کۆشکێك پرسیار کەڵەکە ببێت.

چلو، قاوەو، میوەیان پێشکەش کردین. بەڵام نە من و نە سەرپیل خانیش دەستمان بۆ نەبرد، ئەو گومان و ترسەی ئێمەی تێدا بووین، ئارامی لێ بریبووین و، دەرفەتی خەیاڵی چاو قاوە خواردنەوەی بۆ نەهێشتبووینەوە.

ئەو پزیشکەی کە سەرەتا بینیمان لەگەڵ هاوسەرەکەی ئارەزوو خاندا لە سوچێکی ژوورەکەدا لەسەر بابەتێکی زۆر هەستیار گفتوگۆیان دەکرد. بە هەڵسوکەوت و ڕووخساریاندا دیاربوو کە بابەتێکی زۆر گرنگیان باس دەکرد. پاش ماوەیەکی کەم، دەرگایەك کرایەوە، خانمێك هاتەدەر، فەرمووی چوونە ژوورەوەی لە ئێمە کرد.

لەگەڵ سەرپیل خان بە پەرۆشیەکی زۆرەوە چووینە ژوورەوە.

ئای خودایە! لەگەڵ دیمەنێك ڕووبەڕوو بووینەوە، کە من هەرگیز بیرم لێ نەکردبووەوە، هیچ بە خەیاڵمدا نەهاتبوو.

به پەرۆشی و ترسێکی زۆرەوە چووینە ژوورەوە، بەڵام چی ببینین. ڕووبەڕووی جێگەی نەخۆشێك بووینەوە کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاکشابوو.

لەلای ڕاست و چەپی سیسەمەکەوە شوشەی دەرمان و بابەتی چارەسەرەکانی نەخۆشییەکە ڕیزکرابوون، هەروەها پەرستارێك کە زۆر بە نیگەرانیەوە لە دەوری بوو دەبینرا. کەش و هەوای ئەو دەورووبەرە بارێکی سەرسوڕهێنەری تێدا دەگوزەرا.

## بکوژی ئابڕوو:

دوای ئەوەی کەمێك نزیك بووینەوە، تێگەیشتین ئەو پیاوەی بە "ئاغا" بانگیان دەکرد هەمان ئەو بکوژی ئابڕووەی جاران بوو. ئای خودایە، تۆ چەندە باڵادەستی. مافی ستەم لێکراوان لە ستەمکار دەسێنیتەوەو، سنورەکانت نیشانی بەندەکانت دەدەیت. چەندە دادپەروەرانە ئەرك و مافەکان دابەش دەکەیت!

کاتێك تەندروستی خراپی ئەو مرۆڤە دڕندەیەم بینی، کە ژیانی سەدان کچی پاکی بەبادابوو. لەناکاو کڵپەی هەموو هەستە کڕگرتووەکانم بوونە سەهۆڵ.

لەیەك کاتدا لەگەڵ سەرپیل خان سەیری یەکمان کرد.

ئاگر لە نیگاکانی سەرپیل خان دەباری. لەم نیگایانەوە مرۆڤ دەیتوانی تێبگات سەرپیل خان تا چ ئەندازەیەك ئازارو نەهامەتی بەدەستی ئەو دڕندەیەوە چەشتووە. کەمێك لێی نزیك بووینەوەو،

لەسەر کورسییەك لە تەنیشتییەوە دانیشتین، ئەو پیاوە نوورانییەش کە پێش ئێمە ڕۆیشتە ژوورەوە، مەلایەکی ئایینی بوو و، مێزەر بەسەر بوو و، بەدەنگێکی کز قورئانی دەخوێند.

هاوسەری ئارەزوو خان نوشتایەوەو بەگوێیدا چرپاندی:

"ئاغام، نیلوفەر خان و سەرپیل خانیشمان هێناوە".

من ئەو پیاوەم بە شوناسی "یەلان ئابوزێر" ناسی بوو.. بالابەرزێکی هێزو بازو ترسێنەر بوو، چاوە ناپاکەکانی کەمێك کردەوەو لێوەکانی بە هێواشی جولاند، بەلام ئێمە هیچی لێ تێنەگەیشتین.

## من هەڵە بووم، بمبورن:

لەو کاتەدا هاوسەرەکەی ئارەزوو خان سەری لە دەمی نزیککردەوەو، هەوڵی دا قسەکانی ئەومان بۆ دووبارە بکاتەوە. کە دەیوت:

– " من هەڵە بووم. هەم بەرامبەر ئێوەو، هەم بەرامبەر خودا تاوانبارم.. تاوانی زۆرم ئەنجام دا، ستەمم لە زۆر کەس کرد. ئێستا زۆر پەشیمانم. ئێستاش وا دەچمە حزووری پەروەردگار، تا سزاو ئەنجامی تاوانەکانم وەربگرمەوە. ڕاستییەکەم بۆ ڕوون بووەوە، بەلام تازە زۆر درەنگ بووە.

خوای گەورە لە هەموو تاوان و ستەمکارییەك خۆش دەبێت، بەلام مافی خەڵك، هەرگیز..

مافێکی زۆرم وەك قەرز لە ئەستۆدایە، گەنج بووین بیرمان لەمانە نەدەکردەوە، بەهێز بووین، سەرلێشێواو لەزان بووین. چارەکانمان بەشەڕ ژیانێکی پڕ لە خراپەدا هەڵهێنا. گوێمان بە حەڵاڵ و حەرام نەدەدا. هەرگیز بە بیرماندا نەدەهات ڕۆژێك بێت و ئاوا ژیانمان کۆتایی پێ بێت. یاخود ئەوەی لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت.

وەك دەبینن من لەم کاتەدا باروئۆخم زۆر خراپە، دەزانم تاوان و ستەمکارییەکانی من هی لێخۆشبوون نین، بەڵام هیچ چارەیەکم نییەو، ئێستا پێویستمە. من هەڵەم بووم. هەزاران جار داوای لێبووردن دەکەم.

لەم کاتەشدا بە نیگا لاوازەکانی لە نێمەی دەڕوانی و، فرمێسکەکان ڕژانە سەر ڕوومەتی. ئەوەندە بە لاوازی و بێ دەسەڵاتی و بێ چارەییەوە کەوتە پاڕانەوە کە لە باسکردن نایەت:

"تکاتان لێ دەکەم، بمبەخشن" بەم شێوەیە لێمان دەپاڕایەوە.

بەڵێ.. ئەو "یەلان ئابوزێر"ەی ملمەڵەی بە سەدان کچەوە کردبوو و، کۆشکی هیوای ڕووخاندن. ئەو شاخە نێوەزمەیەی لەچاوی خەڵکدا کێشابوو. بەڵام ئێستا وەك منداڵ دەپاڕێتەوەو قاچ و دەست ماچ دەکات.

ئای خوایە گیان.. ئەمبێت چی لەمە پەندئامێزتر بێت؟! وانەی لەمە نایابتر دەبێت چی بێت؟!

کەسێکی وا ستەمکار، کە بە هێزو دەسەڵات و تاوان و هەڵەکانی تا ئەوپەڕی سنوور لادان و بێ فەرمانیی خوای کردبوو، چەندەها ڕووبار فرمێسکی بە پاکیزەکان ڕشتبوو..

ئەوەندە بەکوڵ دەگریا تکای لێ دەکردین، خانمە پەرستارەکە بەردەوام فرمێسکەکانی بۆ دەسڕی، لەگەڵ سەرپیل لە بەردەم ئەو دیمەنەدا ڕامابووین. لەیەك ساتدا بەسەدان ڕووداوی ناخۆش هاتە پێش چاومان. خۆزگە هەموو کەس ئەو دیمەنە پەند ئامێزەی وەك بەڵگە دەبینی.

بەلام ئاگری تووڕەیی و هەستی تۆڵەسەندنەوەی ناخم هەروا بە ئاسمانی دانەدەمرکایەوە، بەجۆرێك کە سەرلەنوێ جۆشی داو، هەرچی هەوڵم دەدا نەمدەتوانی زاڵ ببم بەسەر ئەو ڕابردووە تاڵەدا، بەلام لەوە دەچوو ئەو گریان و داوای لێبوردنەی خامۆشکەری ئەو ئاگری چەند ساڵەیە بوون.

لەڕاستیدا زۆر سەیر بوو.. چۆن بتوانم ئەو ئازارانەی تەمەنی گەنجیم بیر بچێتەوە...!

ئەو ڕۆژە پڕ لە تاڵیانە، ئەو ڕۆژە پڕ لە ترس و برسێتی و ناڕەحەتیانەی تەمەنی گەنجی خۆمم دەهاتەوە پێش چاو... (بەلان ئابوزێن) کەواتە ئەمەیە دادپەروەری پەروەردگار. بەم

شێوەیەیە کە خوای گەورە مافی بەندە ستەم لێکراو و پاکەکانی دەگێڕێتەوە. لێپرسینەوەی بەر لە قیامەت لەژیانی دنیادا دەست پێ دەکات.

وەکو بڵێی ئەم دیمەنە سەدای حەقیقەتێکی بە گوێی مرۆڤایەتیدا دەدا:

"ئەی ستەمکارەکان، خاوەن دەسەڵاتەکان، ئەی ئەوانەی خەیاڵی لە لوتکەبوونی بەردەوام دروشمتانەو، وادەزانن هەرگیز ناڕوخێن... نەکەن مافی کەسانی تر بخۆن. کۆتاییەکەتان زۆر ترسناکە. ئەگەر ئەمەی کە دەیبینن ئەشکەنجەی دنیاتانە، ئەی دەبێت سزای قیامەتتان چ شێوەیەك بەخۆیەوە ببینێت."

## مارێك یەلآن ئابوزێری خنکاند:

دوای ئەو هەموو پاڕانەوەو هانا بردنەی یەلآن ئابوزێر، کاتێ هیچ کاردانەوەیەکی لە ئێمەدا نەدی. چاوەکانی داخست و هەناسەی ساردی هەڵدەکێشا. پەرستارەکە بەخێرایی دەرزیەکی ئارامبەخشی بۆ کرد. مەلاکەش بە هێمنی بەردەوام بوو لە قورئان خوێندن... بەڵێ، هەر لەو کاتەدا بوو.. ئای خودایە، تووشی چ شۆکێك بووم. هەرکات ئەو ڕووداوەم دێتەوە بیر وەکو یەکەمجار بێت، سەرلەنوێ ترس و تەزووی سەرسوڕمان هەموو لەشم دەگرێتەوە.

بەهۆی ترسناکی دیمەنەکەوە، لە یەك کاتدا لەگەڵ سەرپیل هەستاینە سەرپێ، بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە یەکترمان لە ئامێز گرت.. لەبیرمان چووبووەوە لە کوێین و چی دەکەین و، بۆچی؟

بەڕاستی ڕەنگە تەنها لە چیرۆك و ئەفسانەکاندا بیسترابێت کۆتایی ژیانێکی ئاوا.

مامۆستاش کە لەو کاتەدا قورئانی دەخوێند، لە بەرامبەر ئەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرەدا هەستایە سەرپێ :

– ئای خوایە! الله أکبر.

ئارەزوو خان و پەرستارەکەش بەرگەی ئەو دیمەنەیان نەگرت و ڕایان کردە دەرەوە. تەنانەت هاوسەری ئارەزوو خانیش لە بەرامبەر ئەو دیمەنەدا خۆی بۆ ڕانەگیرا.

یا رب.. یا رب! تۆ چەندە گەورەیت.. چەندە حیکمەت و پەندت زۆرە. ئەم مرۆڤانە بۆ هێشتاش ئەمانە نابینن؟! بۆچی لە بەندایەتی کردنی تۆ ڕوو وەردەگێڕن؟ بۆچی بیر لە کۆتایی ئەم تەمەنەو لێپرسینەوەکانی ژیانی دونیا ناکەنەوە؟! خودایە بۆچی مرۆڤ یادی ئەو مردنە لەبیر ئەکات، کە ڕەنگە هەر ساتێك یەخەی بگرێت؟! چاوەکانمان داخست بوو و، توند گوێکانمان گرتبوو، بەوپەڕی بێچارەییەوە یەکترمان لە ئامێز گرتبوو، (یەلان ئابوزێر) لە ناوەڕاستی ژوورێکی گەورە و ڕازێنراودا دواساتەکانی بەڕێ دەکرد، لەو شێوە ترسناکەو لەبەرچاوی ئێمەدا بەو جانەوەرە

ترسناکانە دەگەیشت. بەڵێ. هەموو شتێ لە بەرچاوی ئێمەدا ڕوویدا. ئەمە خەونێك نیە، خەیاڵ نیە، گومان نیە... ڕاستییە، چونکە لەبەرچاوی شەش کەسدا ئەو ڕووداوە ترسناکە ڕوویدا.

ئەوەبوو بێ ئەوەی بزانین لەکوێوە بوو، مارێکی سەرسوڕهێنەر لە گەردنی یەڵان ئابوزێر ئاڵاو سەری گەست.

ئای خودایە! بەدەی ماراو ئەشکەنجەچەشتنی (یەڵان ئابوزێر) بەدەست ئەو مارەدا تەواوی بوونمانی دەهەژاند، هەمووومان سەرسام بووبووین.بەڕاستی دیمەنێکی زۆر ترسناك و نامۆ بوو، بەدەست ئەو مارەوە (یەڵان ئابوزێر) ئارەقی سەرەمەرگی دەڕشت، لە چاوە داچەقیوەکانیدا تۆقین و سەرسوڕمان دەبینرا.

ئەو نزاو پاڕانەوانەی کە مامۆستا بە ترس و پەشۆکاوی دەیخوێندو، ئەو نرکەو ناڵانەی من و سەرپیل کە یەکمان لەئامێز گرتبوو، هیچ پێشی بە تووڕەیی و هەڵپەکانی ئەو مارە نەدەگرت. تەنانەت هاتو بێزار کرایە زیاتر تووڕە دەبوو و، زیاتر پێوەی دەدا، زیاتر قەپی دەگرت.

## سەرسام و پەشۆکابووین:

ساتێك چاوم لەسەر ئەو دیمەنە تۆقێنەرە لابرد. لە دەم و گوێ و ڕوومەتەکانی (یەڵان ئابوزێر)ەوە خوێن دەڕژاو زمانە پارچە پارچە بووەکەی لە نێوان لێوەکانیدا دەکەوتە خوار! !.. ئەو

دەوروبەرە ئەوەندە پەشۆکا بوو. ئەقڵەکان بەجۆرێك وەستا بوون. هەستەکان بەرەو باوەڕنەکردن و ناجێگیری دەچوون، هیچ کەس دەرفەتی هەوڵی فریاکەوتن و دۆزینەوەی چارەسەری نەبوو.. هەرکەسەو لەناخی خۆیدا ئەو ڕووداوە باوەڕنەکراوەی شی دەکردەوە.

ئای پەروەردگاری باڵادەستم!

ئەمە چ تاقیکردنەوەیەکی پڕ پەند بوو! ئەمە چ دادپەروەرییەکی سەرسوڕهێنەر بوو. چ دیمەنێکی باوەڕپێنەکراو بوو.. ئەو (یەلان ئابوزێر)ەی کە ئابڕوو و پاکیزەیی و خەون و هیواکانی سەدان کچی ڕاپێچی خاك کردو، هیچ کات هەستی بەزەیی نەدەجووڵا ناوی (مار)ی لێنرابوو. تەماشای ئەو دادپەروەرییەی پەروەردگار بکە. ئەو (یەلان ئابوزێر)ەی کە وەکو مار ژەهری دەڕشتە سەر هەستە بەرزو پیرۆزەکانی ئەو مرۆڤانە... ئەوەتا خوای گەورەش لەسەر شێوەی مار فریشتەی گیانکێشانی بۆ ناردو، لەو دیمەنە ترسناکەدا ئارەقی سەرە مەرگی پێ ڕشت.

ئەو دیمەنە هەر کۆتایی نەدەهات.. ئەو پیارەش هێشتا گیانی نەسپاردبوو.. تورەیی ئەو مارە کۆتایی پێ نەدەهات. سەراپای لاشەی (یەلان ئابوزێر)ی گەستبوو و ژەهرخواردی کردبوو.

ئەوەنـدە گیانکێشـانێکی سـەیر بـوو، وەکـو بڵێـی بـە سـەدان قەساب یەڵانیان لەناو جێگەکەیدا پارچە پارچـە کـردووە. ئـەویش لە ئازاری ڕۆح و لاشەی خۆیدا هاواری دەکرد.

وەکو وتویانە:"مـافی کەسـی بێچـارە مـەخۆ، بـەهێمنی گیـان بدە".. بەڕاستی پەروەردگار ئەوەندە دادپەروەرە، کە ئازارو هانا بردن و شینی سەدان کچی بێچارەی لە شێوەی مارێکدا ناردووەو، خستویەتیە گیانی یەڵان، تا تۆڵەیان بۆ بکاتەوە.

ئای خودایە! ئەمە هـەر لـەزاتی تـۆ دەوەشـێتەوە، نیشـاندانی ئەم دیمەنە بۆ پەندوەرگرتنی هاوپیشەکانی دوای خۆی زۆر گـرنگ بـوو. ڕەنگـە ئـەم ئـازارو ئەشـکەنجەیەی کـە ئـەو بینـی تـەنها نموونەیەك بێت لە ملیۆنان نموونەی هاوشێوەی خۆی.. لەوانەشـە تەنها نمونەیەك بووبێت لە شـێوەکانی سـزای نـاو گـۆڕ، تـا ڕۆژی لێپرسینەوە یەڵان و هاوشێوەکانی دەیچێژن.

ئـاە لـەم جـۆرە مرۆڤانــە ئـاە! ئەگـەر تـەنها لـەم ڕاسـتیانە بگەیشتنایە. ئەو هەموو ناپاکی و تاوانانە ڕوویان دەدا؟!

## لەوە زیاتر بەرگەمان نەگرت:

ئێمە لەوە زیاتر بەرگەمان نەگرت و ڕۆیشتینە دەرەوە.

مامۆستاش بەتەواوی سەرسام و تۆقیو بوو و دەپاڕایەوە:

"من شتی وام نەدیوە. باسی مردنێکی وام نەبیستووە، تەوبـە، خوایە گیان تەوبە... بە هانامـان وەرە، یارمـەتیمان بـدە، خوایـە

گیان هەناسەی کۆتاییمان هاوشانی میهرەبانی نەبڕاوەی زاتی خۆت بکەیت". هەمووان دەلەرزین. هیچ کەس ئاگای لەوەی تەنیشتی نەبوو. ئەو هاوارو ناڵاندنەی کە لە ژوورەوە دەهاتە دەر، هیچ کاردانەوەو وەڵامێکیان بۆ نەبوو.

ئیتر ئەم ڕستەیە مێشکی هەمووانی داگیرکردبوو..

"ڕزگارم کەن..."

کێ لەدەست کێ ڕزگار دەکەیت؟! کەس توانای ئەوەی هەبوو..؟! لەو کاتەدا هەموو فریادڕەسێکی لەدەست دابوو... دۆست، دەوڵەمەندی، هێزو دەسەڵات، ناوبانگ... هیچ کام لەمانە بەهانایەوە نەهاتن.

بێ دەسەڵات و زەلیل مابوو. لەو کاتەدا تەنها یەك هێز دەتوانێت یارمەتی مرۆڤ بدات.

- خودا!

بەڵام یارمەتی کێ؟! بەندەیەکی باش.. کە گوێڕایەڵی ئەو بوو بێت.

ئیتر لەو کاتەدا دەوڵەمەندترین و خۆشبەختترین کەس ئەو کەسەیە کە بەندەیەکی باشی پەروەردگاری بوو بێت.

لەو کاتەدا گوڵزار خان هاتەوە خەیاڵم. گوڵزار خانیش، یەکێکی تر بوو لە قوربانییەکانی دەستی ئەو گێژاوە.

زۆر بە گرانیش لەو ژیانە پڕ تاوانە ڕزگاری بوو بوو.. ئەو بەهۆی نقومبوونی لەو دەریای تاوانەدا، پەیوەندی لەگەڵ هەموو خزمەکانیدا پچڕابوو، بەڵام گێڕۆدەبوونی بەم ژیانەوە هەرگیز لەسەر ویستی خۆی نەبوو..

ئەوکاتەی ئەومان ناسی، خانمێکی بێ کەسی تەمەن چلساڵان بوو، کە زۆرینەی کاتەکانی لەسەر بەرماڵەکەی،و، بەدڵێکی غەمگین و چاوێکی پڕ ئەسرینەوە بەسەردەبرد. لەساتی مەرگیدا، لەگەڵ چەند هاوڕێیەك لەپشت سەری بووین. لەڕاستیدا ئەوە مردنێك و ماڵئاواییەك و گەشتکردنێك بوو، کە ئامان خوایە!! ئێرەییمان پێی دەبرد. "خۆزگە ئێمەش مردنێکی وامان بەنسیب دەبوو"

گوڵزار خان لە دوا ساتەکانی ژیاندا هەستایە سەرپێ و، دەستەکانی بەرزکردەوە، پاشان چەند جار شایەتومانی دووبارە کردەوە... ئای خوایە گیان، ئەوە چ بەیەك گەیشتنێك بوو!

وتی (سەروەرمان) و هەستایە سەرپێ.. کۆتا وشەی (سەروەرمان) بوو.

بێگومان سەروەری سەروەرەکان، ئازیزترینی ئازیزان، سوڵتانی سوڵتانەکان تاکێکی بێچارەی ئوممەتەکەی لە دوا هەناسەیدا بەتەنها جێ ناهێڵێت.

ئەمەیە خەلاتی دوا هەناسەی بەندەیەکی باشی خوا..
لەهەمان کاتدا ئەمەشە ناڵەی دوا هەناسەی بەندەیەکی سەرپێچیکار..

لەڕاستیدا ئەمە وانەیەکی گەورەیە بۆ ئێمەو هەمووان.

هەرچەندە بۆ دواجار یەلان نابوزێرمان نەدی، بەلام هیچ گومان لەوەدا نییە کە حاڵی ناو قەبرەکەی زۆر لەوە ترسناکترە کەئێمە بینیمان، بەدرێژایی چەندین مانگ نەمتوانی ئەو دیمەنە لە مێشکم دەرکەم.چەندین مانگ بەو ترسەوە ژیام، تا لەم ساتانەدا بۆم تێگەیشتم کە لێپرسینەوەیەکی زۆر مەزن و وورد هەیە. "ئایا من ئامادەم بۆ ئەو لێپرسینەوەیە؟" بە بەردەوامی ئەم پرسیارەم لەخۆم دەکرد. لە بەرامبەر بەرماڵەکەشمدا تابلۆیەکم هەڵواسی بوو تابلۆکەش ئەم دێرەی لەسەر نووسرابوو: "ئایا خۆمان ئامادەکردووە بۆ مەرگ؟".

## بەتەواوی نوقمی ئەو جیهانە بووبووم

ئەو ئێوارەیە نوقمی خەمێکی زۆر سەخت بووبووم، بەجۆرێك، کە تا ئەوکاتە بەو ئەندازەیە هەستم بە بێزاری نەکردبوو.

ئەو بێزاریەم هەتا ئەمڕۆ هەست پێ نەکردبوو.

ئەم خەمە، خەمی عەشقێك و خۆشەویستیەك و ئومێدێك بوو. ڕەنگە ئەمە بۆ یەکەمین جار بێت لەژیانمدا، ئاوا هەستم بە عەشقێکی بێ لێکدانەوە کردبێت. هەموو هەست و هەموو

خوازیاری و هیواکانم لەناو چەند دێڕێکدا چەقیان بەستبوو، کە بووبوونە مایەی ماتەموکردنی دەروونم: "سەروەرم، من تۆم زۆر خۆش دەوێت". "سەروەرم، ئەم بەندە تاوانبارەی ئوممەتەکەت خوازیاری دیداری تۆیە، بانگهێشتم بکە بۆ دیدەنیت".

"سەروەرم، من زۆر ئەرمەنگ خۆشەویستی و عەشقی تۆم دۆزییەوە، بەڵام چی دەبێت ئەو خۆزگەیەم ببێتە ڕاستی، چی دەبێت منیش یەکێک بم لەوانەی کە بە پاکردنی بەرەو لات دێن، چی دەبێت بە نووری بوونت ڕێنموییم بکەیت بۆ گەیشتن بە دیدارت".

تکایە بەسۆزی خۆت گوێبیستی ئەو گێژاوەی ناخم و ئەو نازاوانەی چاوچەپە پاوچەپەم دەکەن، ئەمە هاوارو ناڵانەمە سەروەرم، تۆ نێردراوی جیهانیت، پێغەمبەری ڕزگارکەری جیهانیت، تەنانەت ئەگەر بەر شەفاعەتی زاتی موبارەکی تۆ نەکەوم، بێ هیوا نابم، بەڵام دەرگایەکی ترم نیە هانای بۆ بەرم، ئەگەر زاتی تۆش دەروازەی خۆشەویستی و میهرو شەفاعەتی خۆتم لێ نەکەیتەوە، ئەوا ئومێدەوارم لەیادت بێت من بەندەیەکی تاوانبارو شکستخواردووم لە بارەگای پەروەردگارو، بە عەشق و خۆشەویستی هەمیشەیی تۆوە هیوای ژیان دەکەم".

هەر تۆیت بە پەیامەکەی پەروەردگار ڕێگەت نیشانی چەندان تاوانبار داوە، دەستی هانات بۆ چەندان بێچارە درێژکردووە، بە

پەیامەکەت چەندان بکوژو بێ ئیمانت ڕێنموویی کردووە، فرمێسکی بێکەسیت سڕیوە بۆیان.. منیش بەندەیەکی خودام، کە گەنجێتیم بە تاوان و سەرلێشێواوی هەڵوەریوە.. کۆشکی هیواکانم ڕووخاوەو، ناپاکیم لە تێکڕای دۆستە نزیکەکانی ژیانم دیوە، پاکترین پەڕەکانی ژیانی بەندایەتیم تەپ و تۆزی تاوان دایپۆشیوە، بێ چارەو تەنها چاولەڕێی شەفاعەتی تۆم. خۆشەویستیم بۆ قورئان و ئیسلام و موسوڵمانان و خۆشەویستانی تۆ تاکە توێشوومە.. ئەو دەرگای شەفاعەتەی بۆ ئوممەتەکەت واڵات کردووە، ئەوا منیش لە هەمان دەرگاوە تروسکەی هیوام بە شەفاعەتت بەدی کردووە. منیش چی تر ئەم دڵە ماندووەم بەرگەی دووریی و خۆشەویستیت ناگرێت. ئەی پێشەوامان، هەر خۆت ڕەحمەتی بۆ جیهان، پێشەوای مرۆڤایەتیت.. ئارامییت بۆ دڵە تەنیاو بێچارەکان، ئومێدیت بۆ ڕووخسارە بێ ڕەنگ و سیس بووەکان، نوورو ڕووناکیت بۆ چاوە خامۆشەکان.. وەڵامی داواکانی ئەوانەی دەڵێن:"کەسێك هەیە بەهانامانەوە بێت؟ دەستمان بگرێت و یارمەتیمان بدات؟ کەسێك هەیە ببێتە شیفای دەردەکانمان؟"ئەوەی کە لە ڕێگەی سەرفرازی جێ دەمێنێت و بێ کەس و بێ ناونیشان و نامۆ، تاکە هیوای (سەروەرم) (تۆ)یت. بێگومان تۆش بە سۆزو ڕەحمەتی خۆت دەیانکەیتە ڕیزی ئەوانەی بە شەفاعەتت خۆشبەختیان دەکەیت.

تۆ کە لەپێناو ئەوەی ببیتە پەناگەی بێ چارەکان بەدرێژایی تەمەنت لە حزوری خوادا دەستت باڵاو ڕووت لە بارەگاکەی بوو.

سەروەرم.. لەگەڵ تۆدا ڕاستی ژیانمان بۆ دەرکەوت، منیش خوازیارم وەك ژیانەوەی پاشماوەی وشکبووی ڕووبارەکان و، گەڵا وەریوەکانو، گوڵە ژاکاوەکان، بژێمەوە. خوازیاری دیداری موبارەکی تۆو، دانیشتنم لە حزوری موبارەکتدا، تا ئەندامی کۆڕی دینداری و ئومێدو عەشق و ئاسوودەییت بم.

## تاکە ئومێدم شەفاعەتی تۆیە:

سەروەرم.. ئەرکی سەروەرەکان، بەهاناوە هاتن و پەنادان و هاوکارییە..دەستەی چاوەڕوانی مژدەی سەرفرازی و ئاسوودەیی هیوایان تەنها زاتی موبارەکی تۆیەو، منیش وەك بەندەیەکی بێچارە بەشداری ئەو هیوا خوازییەیانم.

سەروەرم، تۆ لە پێناو سەرفرازی ئوممەتەکەتدا ژیایت و، ئازارو ناڕەحەتیت بینیو، فرمێسکت بۆ ڕشتن. تۆ ئەوەندە ئوممەتەکەت خۆشدەویست دەتفەرموو:"خودایە، ئەگەر نیعمەتی بەهەشت ناکەیتە نسیبی ئوممەتەکەم، ئەوا منیش تاکێکم لەوان و، شایستەی بەهەشت نیم". سەروەرم، من تاوانکارو هەڵەکارم، بەڵام تۆم بەجۆرێك خۆش دەوێت، ئەگەر گونجاو بووایە، ئەوا هەزاران جار، بگرە سەدان هەزار جار بۆ گەیشتنم بە دیداری موبارەکت ئەم ژیانەم جێ دەهێشت.

ئەوەندەم بەسە یەك نیشانەم پیشان بدەیت. نیشانەیەکی بچووك. بۆئەوەی هیچ نەبێت ئومێدێکی بچووکم لا دروست بێت، پەنجەرەیەکی هیوا و ڕزگارییم بۆ بکرێتەوە. تا مژدەی بەرەیەیانی ئاسوودەیم پێبدات. سەرەوەرم، تەنها هیوایەك لەتۆوە بەسە، تا بە پەرۆشەوە تەئانەت گیانیشیم ببەخشم تا تێمەوە دیدارتە.

ئەوەندە بەسە بانگم بکە.

ئەو زەردەپەڕی ئێوارەیە... ئێوارەیەکی جیاوازبوو.

ئەو شەوە بەشێکم لە پەیامی موعجیزاتی ئەحمەدیم خوێندەوە. ژیاننامەی سەروەرمان، خزمەت و دەراساکانی ماوەی ژیانی، پێشەنگ بوونی بۆ ئومەتەکەی، هەموو ئەمانە سەرلەنوێ و بۆ چەندەها جاری دیکەش دووچاری سەرسامی دەکردمەوە.

ئەو خۆشەویستی و پەرۆشییەی دیدارم بۆ ئەو زاتە بالی کێشابوو بەسەر تێکڕای چرکەکانی ژیانمدا. لێدانەکانی دڵم لە سینەمدا ئارامی نەدەگرت. ئەو شەوە چاوەکانم لە چاوەڕوانی ئومێدێك بوو. ئەو ئێوارەیە بە تێکڕای بوونمەوە چاولەڕێی هیوایەك بووم. ئەو شەوە لەبەردەم کۆشکی خۆشەویستی و ئەوینی سەروەرمدا چاوەڕوان بووم. هەستەکانی ناخم جریوەی هەواڵێکیان دەدا بە گوێمدا.

وەك بڵێی ئەمشەو هەواڵی "بەڵێ یان نەخێر" وەبیستم... لەم نێوەندەشدا تەنها ئەوەم لەدەست دەهات ئومێدەوارییم.

## چاوەڕوانی تروسکەیەکی مژدە بەخش بووم:

چاوەڕوانی تروسکەیەکی مژدەبەخش بووم لە سەروەرمەوە. سەرەڕای ئەوەی دەمزانی شیاوی ئەوەش نیم... شەوێکی دیکەشم گەیاندە بەرەبەیان، لەسەر بەرماڵەکەم و، لەو کەش و هەوا ئیمانی و ڕۆحیەدا لەگەل فرمێسکەکانم و دڵێکی پەرۆشی چۆلەکە ئاسا لەدوای نوێژی بەیانی خەو بردمیەوە. ئەمە ئەگەر پێی بوترێت نووستن! بە چاو و دڵی پەرێشانو، هزرو بیری ماندو و شەکەتمەوە. هەموو دنیام ئامادەکردووە تا وەك دیاری بیکەمە قوربانی لەپێناو ئەوینێکدا.. دەبێ بەمە بوترێت خەوتن؟!

ژینم بووە مەیدانی جەنگ، خۆشم وەکو برینداریك خەڵتانی خوێن بووم. هەڵە و ڕاستەکان، ناحەزو قەشەنگەکان، سەرزەنشتکەرو دۆستەکان، خەیاڵ و ڕاستەقینەکان..

دووبارە لە گێژاوی خەیاڵ و بیرە ئاڵۆزەکانمدا ون بووم... لە دەریای ئەوینێکی خەیاڵیدا ژینم دەکرد.. من کێم؟ سەروەرمان کێیە؟ئایا مرۆڤ دەتوانێت لەسەر ڕووی ئاو بنووسێت؟ لە تاریکیدا چاوەکان توانای بینینیان هەیە؟ گوناهەکان بە ئاسانی دەسڕدرێنەوە؟ پەروەردگاری جیهانیان بەزەیی بە کەسێکدا دێتەوە کە تێکڕای تەمەنی سەرپێچی کردن بووە؟ ئەی ئەگەر وابێت؟! بە ناچاریی خۆم لەگەڵ دوائومێدو سەرفرازی و...بە دڵێکی شکاوەوە سرووچی ژیانم گرتبوو.

•

چەندە لەسەنگەری ئەو جەنگەدا مامەوە؟ نازانم، تەنها شتێك لەبیرم بێت بریتی بوو لەوەی کەجێگەی خەوەکەم وەك دۆزەخی لێهاتبوو و، لە هاواری خۆم بەئاگا هاتمەوە. لە دەنگی خۆم بە ئاگا هاتمەوە، کە دەلەرزیم و دەمووت:"چیتر بەرگە ناگرم، ئەی پێغەمبەری خوا! بگەرە هانام، وەختە لە دۆزەخی تاوانەکانمدا دەتوێمەوە.."

ئەوەندە لە دوودڵی و پەرۆشی و پەشۆکاوییدا بووم، کە تەواو کاتم لەبیر چووبووەوەو، لەبیرم نەمابوو، لە کوێم و کێم و چۆنم!!؟ تەنانەت لە دواییدا زانیم کە چەند جار زەنگی تەلەفۆنەکەیشم لێیداوە..وەکو منداڵێك کە لە برسا تاو ئەداتە پارچە نانێك، دەستم دایە تەلەفۆنەکە، بە خەیاڵی ئومێدێکەوە وەڵامم دایەوەو، ئەوەندە ساتەکانم ئاوێتەی یادی پەروەردگارم بووبوو، وتم:

"خودایە، ئیتر مژدەیەك نیشانی ئەم بەندە بێ چارەیەی خۆت دەدەیت؟!".

پەشۆکابووم... دەنگێك لە تەلەفۆنەکەدا وتی:

– "نیلوفەر خان".

ئای خودایە، نورای خان بوو تەلەفۆنی دەکرد...لەدڵی خۆمدا دەموت:"إن شاء الله ئەم بەیانییە موژدەیەك دەبیستم".. خودایە ئەوە چ پەرۆشییەك بوو، تەنانەت نەمتوانی بەتەواوی بوەستم،

دەستم توند بە دیوارەکەوە گرتبوو، تا بتوانم بەسەر خۆمدا زاڵ ببم.نورای خان، لە هەناسەکانمەوە کەمێك هەستی کرد کە نائاساییم:

– "شتێك بووە نیلوفەر خان؟ ئێوە باشن؟".

بە هەرحاڵێك بوو وەڵامم دایەوە:

– "شکور بۆ خوا، خوشکەکەم..."

– "نا نا.. تۆ باش نیت. دەنگت دەلەرزێت، ئەگەر نەخۆشیت با بێین بتبەین".

– " من باشم، خوشکەکەم.. لەناکاو بەزەنگی تەلەفۆنەکە بە خەبەرهاتم، بەهۆی ئەوەوەیە".بەدڵنیاییەوە نەدەکرا باسی ئەو گەردەلوولی ئەوینەی ناخم بۆ نورای خان بگێڕمەوە. چونکە هێشتا لەوە دڵنیا نەبووم، سەرەڕای ئەوەش من شیاوی ئەو شکۆمەندییە نەبووم.

– "ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بێت تازە لەخەو هەستابیت؟!"

وادیاربوو نورای خان دەیویست زیاتر لەو بارەیەوە قسە بکەین، بەڵام من خۆم لە پرسیارەکەی دزییەوە بە وتنی:

– "شەو کەمێك درەنگ نووستم".

– "خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ئەم ڕۆژگارانەو هاوشێوەیان لە لاپەڕەی ژیانمدا زۆر بکات، من زۆر باشم".

– "باسەکانی کوڕەکەی دوێنێ چۆن بوو لات؟"

- " زۆر جوان بوون.. ئەو ژیاننامەیەی پێغەمبەرﷺ و، ئەو نموونەو بەسەرهات و ڕووداوانەی ئەو زاتە منیان بەرەو دونیایەکی پڕ هیواو ئومێد برد، تا ئێستاش لە خەیاڵی ئەو جیهانە مەزنەدام."

- "ئەو خانمە موسوڵمانە هۆڵەندیەی کە لە بارەی (پەیامەکانی نوور)ەوە قسەی کرد، بەلاتەوە چۆن بوو؟"

- "زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوو. لەڕاستیدا ئێمە نرخی زۆرێك لە بەخششەکانی پەروەردگارمان نازانین، هەست بە گرنگی و نرخی هاوارەکانی ناخمان ناکەین."

ئەو خاتوونە خەڵکی هۆڵەندایە، بەسەردان هاتۆتە وڵاتەکەمان، ماوەی سێ ساڵە بێ وچان وێڵی ڕاستی بووە، بۆ ئەم مەبەستەش بەباشی فێری زمانی تورکی و عەرەبی بووە.پەیامەکانی (نوور)ی سەعید نوورسی دەست کەوتووە.

دەیەوێت کۆمەڵێك بابەتی زۆر گرنگی نووسەرێکی خۆمان بۆ باس بکات.. خودایە گیان مرۆڤ نازانێت بەم هەلەی کەسێکی بیانی دڵخۆش بێت یان خەمبار؟! ئەمە لەکاتێکدایە کە ئێمە لە دواکەوتوویی و نەزانیی و، وتنی "ئاهو ئۆف" ڕزگارمان نابێت.

بەڵام چیمان کردووە لەپێناو گۆڕینی ئەم بارودۆخەدا؟ بەرنامەڕێژیمان بۆ ڕۆژەکانی ژیانمان هەیە؟ سنوورێکی کۆتایی بۆ کات بەفیڕۆدانمان دادەنێین؟ بۆ برەوپێدانی زانست و

زانیاریەکانمان هیچ هەوڵێکی دامەزراومان داوە؟ هەوڵ بۆ بەباشی تێگەیشتن لە زانستە ئیسلامیەکان. هەوڵماندداوە زمانی عەرەبی فێرببین؟! ئامادەین فێری زمانی ئینگلیزی ببین تاکو ڕاستییەکانی ئێمان بگەیەنین بە بیانیەکانیش؟! بۆ چارەسەرکردنی دەردەکانی موسوڵمانانی وڵاتی خۆمان و جیهان دووچاری سەختی هاتووین؟! تا چەندە دەروونمان بە دیمەنی جەنگەکان کاریگەر دەبێت؟ بۆ پاڵپشتی کردنی ئەو خوشك و برا لێقەوماوانەمان قوربانیمان داوە؟! تا چ ئاستێك لەبیری ئەواندا بووین؟

دادە، ئێمە هەموو کات بۆ تاوانبارەکان گەڕاوین، ئایا خۆمان تا چ ئاستێك تاوانبارین؟! ئەگەر بەشوێن چارەسەری ناتەواوی و کەم و کورپییەکدا بگەڕێین، ئەوا دەبێت سەرەتا لە خۆمانەوە دەست پێ بکەین...

- "بڕیارە لەگەڵ نۆزلەم خان یەکتر ببینین؟"

- "بەڵێ ... خودا باشی بۆ بکات، جاروبار پەیوەندیم پێوە دەکات و، ئامۆژگاریم دەکات. هەمیشە لە تەنگەژە ماددی و مەعنەویەکانی ئەم دواییانەمدا هاوکارم بووە".

ئەم پرسیارو تێبینیانەی نورای خان، لەم کاتەی بەیانی و، بەم شێوەیە بێ پێشەکی سەرنجی ڕاکێشام و دڵەڕاوکێی لا دروست کردم، چونکە دادە نورای بەشێوەیەکی لەناکاوی ئاواو، بۆ ئەم

قسانە پەیوەندی نەدەکرد. وادیاربوو مەبەستی ئەو ئامادەکردنی من بوو بۆ باسی بابەتێکی تر، بەڵام نەیەوێت سەرەتا ئارامم بکاتەوە، منیش بۆئەوەی نەبێتە بێ ڕێزی، نەمویست بپرسم.

## ئەو مژدەیەی چاوەڕێی بووم:

پاش ماوەیەك لە گفتوگۆ، دوای ئەوەی هەستی بە هێوربوونەوەی دەنگم کرد، ئەو باسەی کردەوە:

- "کەمێك پێش ئێستا سەیدا پەیوەندی پێوەکردم".

ئای خوایە گیان! بە بیستنی (سەیدا) تەزوویەك بە دەروونمدا هات، بە بیستنی ئەو ڕستەیە، دەستبەجێ لە شوێنی خۆم دانیشتم.ئەو ناوە لە خەیاڵمدا هەر دەنگی ئەدایەوە، تێنەگەشتم نورای خان باسی چی دەکرد، هەر چۆنێك بوو زاڵ بووم بەسەر پرسیارەکانی مێشکمدا، تاکو بتوانم تێی بگەم. نورای خان بەئاگای هێنامەوە:"کچێ، ئەوە چیت بەسەرهات؟!"بەزۆر توانیم بڵێم

- "هیچ نیە"...بەڵام ئەو زۆرباش لەحاڵی من تێگەیشتبوو. چۆن نەزانێت؟ ئەو یەکێك بوو لەو کەسانەی لە نزیکەوە ئاگاداری هەستەکانی من بوو بەرامبەر (سەیدا). لەبەرئەوە دیسان لە سەرەتاوە قسەکانی دووبارە کردەوە..

- "ئەم بەیانییە سەیدا تەلەفۆنی بۆ کردم".

بەوپەڕی وریاییەوە گوێم لە نورای خان گرتبوو...

- "ده ڕۆژ لەمەوبەر خەونێکی بەتۆوە بینیوە".

بەپەرۆشییەوە:

- "خەون لەبارەی منەوە؟!"

- "بەڵێ".

لە خۆشحاڵی و سەرسامیدا توانای قسەکردنم نەمابوو .. بێ ئەوەی بپرسم چی بوو، چۆن بوو... هەر چۆنێك بێت، تەنها لە خەونەکانیشیدا بوونم هەبێت، بۆ من زۆر بوو... بەو پشکە کەمەش هەر قایل بووم..

یەکێك بوو لە شەیدایانی خواو پێغەمبەرو ئایینەکەی... چیتر چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد... تەنانەت هیواخوازی ئەوینیشی نەبووم. ئەوەندەم بەس بوو، کە لە دنیای ئەودا جێگەیەکم هەبێت. ناوەڕۆکی ئەم خەونەش هەرچی بێت، بۆ من وەك دنیایەك هیوا دەهاتە پێش چاو.

ئیتر لە پەرۆشیمدا بەسەختی هەناسەم دەدا، بە بیستنی کۆتایی ڕستەکە... ڕەنگە بڵێم زۆر بە ئەستەم توانیم زاڵ ببم بەسەر هەڵچوونی دەروونمدا، کاتێ پاشماوەی قسەکانیم گوێ لێبوو هەوڵی زۆری خۆممدا بۆ بەرگەگرتن.

-"ئـ...ئەی دواتر؟" پاش چەند چرکەیەك وەستان، ئەم ڕستەیەم وت.. بە وێنەی شێتێك، کە بۆ چەند چرکەیەك ژیریی لەدەست دابێت هەڵسوکەوتم دەکرد.

- "سەیدا، بۆ چوونە دیداری سەروەرمان (پێغەمبەرﷺ)، بڕیاری دا بەمەبەستی (عەمرە) بچێتە ماڵی خوا، بۆ ئەمەش ناوی خۆی و، ئۆزلەم خان و، هاوسەرەکەی (کاك مەتین)و، منیشی نوسیوە. سەرەڕای چەند دۆستێکی تریش.

وەکو پێم وتی سەیدا لە خەونیدا تۆی بینیوە کە پێت وتووە: "چی دەبێت منیش لەگەڵ خۆتان بەرنە زیارەتی حەزرەت! " ئەم خواستەی تۆش کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر سەیدا بەجێهێشتووە. لەبەرئەوە وتی پێت بڵێم، ئەگەر نیەتی هاتنت هەیە، تا ناوی تۆش تۆمار بکات."

لەڕاستیدا ئەمە ئەو مزدەیە بوو کە ڕۆحی بێچارەم چاو لەڕێی بوو. لەبەرئەوە دەمویست لە خۆشحاڵیدا بفڕم، بەجۆرێك کە جڵەوی خۆمم لەدەست دابوو، نەمدەزانی چیم دەوت، بەوێنەی منداڵێکی خۆشحاڵ دەهاتمە پێش چاو کە لە دیدەیەوە تیشکی ئاسوودەیی و شادی دەبارین.

هێـواش هێـواش هەسـتم دەکـرد، تـابلۆی دەروونم لەپشـت هەورەکانەوە هەڵدێت و، هەر لەوێوە بـەرەو لای پێغەمبـەر ﷺ لـە شەقەی باڵ دەدات!.. ئەم دڵە شـەکەتەم چۆن بتوانێـت بەرگـەی وەها مژدەیەك بگرێت؟!

یا رسول الله بەرەو نووری دیاری تۆ دێم..

لەدوای ئەو موژدەیە چی ڕوویدا، لەیادم نایـەت، کـە چۆن لـەو کاتەدا لەهۆش خۆم چووم، هەر کە نـوورای خـانیش هەسـتی بـەم کەوتنەم کردووە، دەستبەجێ خۆی گەیاندووەتە لای من.

ئـەوەبوو بـە دەنگـی زەنگـی دەرگاکـە بەئاگاهاتمـەوە، دوای ئـەوەی کـە چـەند کاتـژمێرێك بـوو لـەهۆش خـۆم چووبووم و بـێ ئاگابووم.

کاتێ هەستام بچم دەرگاکە بکەمەوە، هەستم بـە هـیچ شـتێکی ئەم جیهانە نەدەکرد... سەراپای ئـەم گەردوونـە بـە ئـەوینی ئـەو نازدارەﷺ ڕەنگ کرابوو.

سـەرووەرەکەم.. خەونـەکانم بوونـە ڕاسـتی.. ئـەوا ئێسـتا وەك باڵدارێك دێمە مەملەکەتی موبارەکت.

ئیتر... ڕێبواری سەر ڕێگای شادبوونم بەتۆ.. تـەنها تروسـکەی ئومێدی من تۆیت... تەنها فریادڕەسم شەفاعەتی زاتی موبـارەکی تۆیە.

سەروەرەکەم.. ئەم شەرەفەم پی ڕەوا ببینە.. من دوور لە دونیای میهرو مەحەببەتی تۆ ژینم بۆ چییە؟! بە منەتی میهرەبانیت لەڕیزی شوێنکەوتووانی ڕێبازەکەتدا قبوڵم بفەرموو. ئەم دەریای تاوانەم بە چ دەستێکی میهرەبان جگە لە پەیامەکەت پاکژ دەکرێتەوە؟!

سەروەرەکەم.. لە خانەقای شوێنکەوتووانی ڕێبازەکەتدا چی دەبێت قبوڵم بفەرموو.

کاتێك بەرواری ڕۆژی سەفەرکردنەکەیان پێڕاگەیاندم، لە خۆشحاڵیدا خۆم بە خاوەنی سامانی هەموو دونیا دەهاتە پێش چاو..نەمدەتوانی دەروونی ئاسوودەم جڵەوگیر بکەم.. چونکە تاکە تروسکەی ئاسوودەیی دەروونم و، لەلایەکی دیکەش زیندووبوونەوەی ئەو ئومێدە خامۆشەی ناخم بوو سەبارەت بە سەیدا.

تەنها ترسم ئەوەبوو هۆکارێك ببێتە کۆسپ و ئەم سەفەرەم بە نسیب نەبێت.. بۆ ئەم مەبەستەش بە ئەندازەی چەندەها کێو نزام کردبوو. دڵم دەریایەك بوو لە ڕازو نیاز بەجۆرێك، کە تەنانەت گرنگیدانم بە خواردن و خواردنەوەش پشتگوێ خستبوو. تەنها بیرم لە یەك ئامانج دەکردەوە، ئەویش (گەیشتن بە سەروەرم) .

هەرگیز ئەو ڕۆژە لەبیر ناکەم کە کەوتینە ڕێ؟! لەو ساتانەدا گەردەلوولی تاسەی بینینی و، دەریای ئەوینی سەراپای بوونمی

هەژاندبوو. ئەم گەشتەی کە تەنها لە خەونەکانمدا وێنام کردبوو، بۆتە ڕاستی..

بڵێی ئەمە ئەو مژدەیە بێت کە چەند مانگێك پێش ئێستا کچە شەهیدەکە پێی وتم... بە ئامادەبوونی سەیداش؟

## ئەم سوپاسگوزاریە چۆن دەکرێت

خودایە چۆن سوپاست بکەم؟! دەبێت چ هەڵوێستێکم بۆ ئەم بەخشش و میهرەبانیانەت هەبێت؟! بەرامبەر ئەم لوتفەت کارێکم لەدەست دێت؟! چۆن بەندەیەکی شیاوی بارەگای تۆبم؟!

ئەی تاکە پەناگەی بێ کەسان، بەهاناوە چووی ستەم لێکراوان، سارێژکەری ئازارەکان، دڵدەدەری هەتیو و بێ کەسەکان... پەروەردگارم..!

من پەرۆشی دیداری ئازیزترین بەندەی تۆم ﷺ، ئەوا دەچمە حزووری موبارەکی، خوایە گیان ئەو شەرەفەم پێ ببەخشیت.

بەیاوەری ئەو کەسایەتییە دێم کە چەندین ساڵە بە ئومێدی دەستێشخەرییەکی ئەوەوە دەژیم، هەرگیز پێشهاتێکی لەم جۆرەم بەبیردا نەهاتووە.. سەرەڕای ئەوەی ئەو تەنانەت بۆ یەکجاریش بەو شێوازە بیری لەمن نەکردووەتەوە. دڵنیام کە ناخی ئەو هاوشێوەی ناخێکی تاوانباری وەك من نیە، ئەو ڕاستییەم دەزانی، بگرە دڵنیاش بووم، بەڵام نەمدەتوانی جڵەوگیری ئەو هەوڵانەم بکەم و دەستبەرداری واقیع ببم.

گەشتەکەمان بە فڕۆکە دەست پێکرد.. بەڵام قەبارەو ئاستی جۆش و خرۆش و پەرۆشیم لە باسکردن نایەت؟! لە فڕۆکەکەدا بە پەرۆشیم مۆم ئاسا دەهاتمە پێش چاو، چۆن پشووم بدایە، چۆن؟!

ڕووگەم بەرەو لای دونیای ئازیزانم بوو، ئەو خەونەی کە ساڵانێکە لە هزرمدا وێنای دەکەم، لە چاوەڕوانی گەیشتن بە حزوری موبارەکی سەروەرمدا بەردەوام لەبەرخۆمەوە دەمموت:"ئەوا هاتم با رسول الله، بەسۆزو میهری خۆت لە شەیدایانی خۆتم قبول بفەرموو".

ئەوەی منی بەرەو نادیار دەفڕاند فڕۆکەکە نەبوو، بەڵکو گەردەلوولی حەسرەت و ئەم هەستانەم بوو.

لە لایەکمەوە (دادە ئۆزلەم) دانیشتبوو، کە تەمەنی لە خزمەتی ئیماندا فیداکردووەو، ڕۆحێکی وەك فریشتەی هەیە، لەلاکەی دیکەشم (دادە نوورای)یە کە زۆر سەرسوڕهێنەرانە گەڕاوەتەوە بۆ لای پەروەردگاری و، عەشقی بەدیهێنەر سەراپای بوونی داگیرکردووە. لەم نێوەندەشدا بەندەیەکی تاوانبار (من- نیلۆفەر) لە نێوانیاندا ڕاماوم. بە ئەسپایی ئەسرینیان دەڕشت.. هیچ کەس ناڵەی دەروونی ئەوان نابیستێت.. لێوەکانیان هێواش هێواش دەجوڵاند بەیادی خوا، صلوات دان لەسەر گیانی سەروەرمان، دڵنیابووم کە دڵی ئەوانیش وەکو دڵی من بە توندی لێدەدات.

لەو دونیا ئەندێشاویەدا چەندە ڕۆچووبووم، نازانم...

کاتێ بە ئاگا هاتمەوە، بینیم خورمایان پێشکەش دەکرد.

## وتووێژێکی تاسە ئامێز

لەو نێوەندەداو پاش تێپەڕبوونی کاتێکی کەم، گفتوگۆیەکی زۆر شیرین دەستی پێ کرد. لەم گەشتە پڕ حەسرەتەدا گفتوگۆیەکی تاسە ئامێز کە داستانی ژیانی لەخۆگرتبوو هاتە کایەوە.

ئێمەش بە تەواوی بوونمانەوەو بە هۆگرییەوە گوێمان ڕادێرابوو.

هاوسەری ئۆزلەم خان (کاک مەتین) و(سەیدا)و پیاوێکی تر کە نەمدەناسی. لەم نێوەندەدا هەرسێکیان یەکیان گرتبوو.

ئەم گفتوگۆ سەرنج ڕاکێشە، بە دەنگێکی سەیدا دەستی پێکرد کە بەرزبووەوە:

– "ئااا.. کەواتە ئێوە ئەو زاتەن؟"

ئەو پیاوە بە هێواشی وەڵامی دایەوە:

– "بەڵێ بەڕێزم.. بەداخەوە من ئەوم".

– واتە ئەو کەسایەتییە بەناوبانگەیت.. ئەو مامۆستای زانکۆیەی کە لە ئەمریکا خەڵات کراوەو، ڕێگەی سەرفرازی دۆزیوەتەوە، ئەم هەواڵەش لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراوەتەوە.

- أستغفرالله بەڕێزەکەم.. ئەوەندەش بەناوبانگ نیم.. ڕاستە لە ئەمریکا خەڵات کراوم.. هەروەها مامۆستای زانکۆم... لەسایەی میهری پەروەردگاریشمەوە ڕێگای ڕاستم دۆزیوەتەوە.. بەڵام هیچ کام لەمانە ناتوانن ناوبانگێکی شکۆمەندانەو شایستە بۆ مرۆڤ مسۆگەر بکەن. بنەمای ناوبانگ لای من بەتەواوی شێوەیەکی دیکە لەخۆدەگرێت.

مەگەر مرۆڤەکان لەتوانایاندایە کۆشکی شکۆمەندی ڕاستەقینە بنیاد بنێن.

بەڵام ئایا لەسەروو ئەم خەیاڵانەوەو دوور لە زیادەڕەوی، تەنها سەروەرمان شایستەی ناوبانگ و شکۆمەندییەك نیە کە بۆ مرۆڤ بڕیار درابێت؟ سەیدا بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش ڕۆیشتە سەر باسەکە:

- "ئێمە کورتەیەکمان سەبارەت بە گەشتی بەڕێزتان خوێندووەتەوە لەپێناو گەیشتن بە ڕێگەی سەرفرازی دونیاو دوارۆژ، بەڵام ئەگەر ئەرك نەبێت پێمان خۆشە لەخۆتەوە بیبیستین... دڵنیام لەم ڕێگە پیرۆزەدا پەرۆشی و تاسەمەندییمان کەمێك تێرئاو دەکات".

ئەو مامۆستا بەڕێزەش بەدەنگێکی میهرەبان و کاریگەرو، بەبێ هیچ ناڕازیبوونێك، بە ئەسرین ڕشتنەوە کەوتە باس کردنی بەسەرهاتی ڕابردووی پڕپەندی، ئەو کەمانەی لە گەنجیدا ڕۆڵی

تێدا دەبینین.. هەروەها چۆن گەڕاوەتەوە لای خواو پێغەمبەرەکەی، لەو وێستگە پیرۆزانەی ژیانیدا چی بەسەر هاتووەو، چۆن گەیشتۆتە ئەو پلانە...

ئێمەش بەتەواوی هۆش و هەستێکی سەرسوڕهێنەرەوە گوێمان ڕادێرابوو.

## بەسەرهاتی ژیانی کاك ئەحمەد

- "ناوم ئەحمەدە، منداڵی دەڤەرێکی زۆر هەژاربووم. خێزانەکەشم تابڵێی کەم دەرامەت و نەدار بوون. شەش خوشك و برابووین. منیش بچووکی ماڵ بووم. باوکم بەدەست نەخۆشییەوە دەیناڵاند، دایکیشیم ئافرەتێکی گوندنشینی ساویلکە بوو، کە نەهامەتی زۆری چەشتبوو. لەلایەك شەش منداڵ و لەلایەکی دیکەش هاوسەرێکی نەخۆش... بەڵام سەربەرزییەکی سەرسوڕهێنەری هەبوو بۆ بەڕێوەبردنی خێزانەکەمان... ئاه لەو ساڵانە! خودا بەسەر هیچ کەسی نەهێنێت.

ئەو خوشکەم کە بە تەمەن گەورەی هەموومان بوو، هەر لە تەمەنی منداڵیدا بوو هاوسەرگیریی کرد.

بێگومان ئەم هاوسەرگیرییەش لەسەر خواست و بەڕەزامەندی خۆی نەبوو، نازانم پێویست دەکات باسی بکەم کە ئەو هاوسەرگیرییە چ دەرئەنجامێکی بۆ خوشکەکەم ئامادەکردبوو؟!

ڕەنگە خوای گەورە لەپێناو کۆتایی هێنان بە ئازارەکانی بووبێت

کە ڕۆحی بردەوە بۆلای خۆی و، ڕزگاری کرد... ڕزگاری کرد، بەڵام دیمەنی دوا هەناسەکانی ژیانی تا ئێستاش ناخم دەسووتێنێت و، وەکو خەنجەرێکی ژەهراوی دەروونم پارچە پارچە دەکات..

ئەوکاتە بە منداڵی دووەمی دووگیان بوو، لەکاتی منداڵبوونەکەیدا بارێکی نائاسایی بەسەرهاتبوو، لەبەرئەوە هاوسەرەکەی بردبوویە نەخۆشخانە.. لەوێ، لەبەرئەوەی پارەی تەواویان پێ نەبووە بۆ چارەسەرەکە کاری پێویستیان بۆ نەکردووە، خوشکەکەشم بەهۆی خوێن لێ ڕۆیشتنێکی زۆرەوە، لەسەر جێگەکەی گیانی سپاردووە.

ئەم هەواڵەش دڵی دایکم و باوکمی داچڵەکاندبوو. ئێمەی خوشك و براکانیشی جگە لە خەم خواردن و بێچارەیی هیچ کارێکی ترمان لەدەست نەدەهات.

دایکی بێ چارەم ئەوەندە ناسۆری و تاڵاوی چەشتبوو، کە بۆ تەنها ساتێکیش بێ چاوی ئەسریناوی نەمدەبینی. ئەو ڕۆژگارە من لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم و، ئاستی نمرەکانیشم زۆر باش بوون. لەدوای مردنی خوشکە گەورەکەم دوو خوشکم مابوون.

بەداخەوە ئەوان خوێندەوارییان نەبوو. دوو براکەی دیکەشم لەپێناو گرتنەئەستۆی بەرپرسیاریەتیەکانی ماڵ نەیاندەتوانی

کاتی پێویست بۆ خوێندن تەرخان بکەن. لەبەرئەوە ئارەزووی خوێندنیان نەبوو.لەم نێوەندەدا هەموو ئومێدێکی خێزانەکەمان من بووم.

چەندەها جار دایکم و باوکم تکایان لێ دەکردم:

"کوڕم، زۆر هەوڵ بدە.. هەم خۆت و هەم خوشك و براکانت ڕزگار بکە.."

ئەم وشانەی ئەوان لەو ژیانە سەختەی ئێمەداو، لە نەداری و هەژاری خێزانەکەماندا، جگە لە سەرکەوتن هیچ هەڵبژاردنێکی تری لە بیری مندا نەهێشتبووەوە.

چەندەها جار، پەیمانم بەخۆم دابوو:"لەسەر ویستی خوای گەورە، سەردەکەوم و ئێوە ڕزگار دەکەم".

لەبەرئەوە بە پەرۆشی و خەمخۆرییەکی زۆرەوە لە وانەکانمدا تێدەکۆشام، لەم لایەنەشەوە گەورەترین یارمەتیدەرم (نیلوفەر خان) بوو".

هەر کە گوێبیستی ناوی "نیلوفەر"بووم، ئاوڕم دایەوە.

بۆ یەکەم جار ئەو پیاوە سیما نوورانییەم بینی، کە تەمەنی لەنێوان پەنجا بۆ پەنجاوپێنج ساڵ دەبوو.. بێگومان ئەو نیلوفەرەی ئەو باسی لێوە دەکرد من نەبووم.

لەو چیرۆکە پڕ نەهامەتییە بەردەوام بوو:

– "نیلوفەرخان مامۆستای سەرەتاییم بوو. مرۆڤێکی زۆر ڕۆح سووک و دەست و دڵ خاوێن بوو، لە هەمان کاتدا دیندار و داپۆشراو بوو. لە تەمەنی گەنجیدا هاوسەرەکەی و کچە دوو مانگەکەی لەدەست دابوو.. لەدوای ئەو پێشهاتەوە تەمەنی خۆی بۆ خوێندکارەکانی تەرخان کردبوو.. هەر بەم هۆیەشەوە بۆ من بووبووە فریشتەی شارۆچکەکە، دایک و، مامۆستاو، هەموو شتێکی نومێد بەخشی ئەو ناوچەیە.

لەپێناوی ئێمەدا زۆر تێدەکۆشا، هانی دەداین بۆ سەرکەوتن لە خوێندنەکەماندا، بەرەو لوتکەی سەربەرزی ئاراستەی دەکردین. شانبەشانی وانەکانیش لە حیکمەت و جوانیەکانی ئیمانیشی بۆ باس دەکردین و تێی دەگەیاندین.

باسی بەخششەکانی پەروەردگاری بۆ دەکردین، چیرۆکی کاریگەری لەسەر کاری ڕاست و دروست بۆ دەگێڕاینەوە. ئێمەش لەبەرئەوەی مامۆستاکەمان زۆر خۆش دەویست، بەگوێی دڵ گوێمان بۆ دەگرت.

ئەو مووچەیەش کە وەریدەگرت لە پێویستیەکانی ئێمەدا تەواوی دەکرد. چەندین جار کراس و پانتۆڵی بۆ دەکڕین. چەندین جار یارمەتی دەداین و ماودەممان بوو. چەندین جار دەرمانی بۆ نەخۆش پەیدا کرد.

چەندین جار دەوڵەتی لە یارمەتیدانی شارۆچکەکەمان ئاگادارکردەوە. ئەو هەموو شتێك بوو بۆ شارۆچکەکەمان.

جۆگەو ئاوێکی گەورە کە لە کەناری شارۆچکەکەمان هەبوو. ئەو دەوروبەرە چڕە بە دارودەوەن. منداڵەکان لەوێ مەڕو ماڵاتیان دەلەوەڕاند.

ئاوی جۆگەکە زۆر نیە. بەڵام لە بەهاردا بەهۆی ئاوی بارانەوە قووڵ و بەخرۆش دەبێت و لافاو دروست دەکات، لەبەرئەوە زۆر گیانی لەگەڵ خۆی بردووە.

بەڵێ، محمد کە یەك ساڵ لە من گەورەتر بوو و هاجەر کە سێ ساڵ لە من گەورەتر بوو لە ڕۆژێکی بەهاردا کە بارانیش نیە، دەچنە لای جۆگە ئاوەکە بۆ لەوەڕاندنی مەڕوماڵات. لەو ڕۆژەدا باران دادەکات. هەرچەندە کەمێك باری بەڵام مەگەر لە شوێنە بەرزەکانی شارۆچکەکەدا زۆر دەبارێت کە دواتر لێژ دەبێتەوە ناو دۆڵ و جۆگەو دەوەنەکان و ئاوەکەی هەڵدەسێت... بە داخەوە چوار منداڵ لە منداڵەکانی شارۆچکەکە دەکەونە ناو لافاوی ئاوەکەو دەمرن. دوانیشیان محەمەد و هاجەر دەبن.

ئەو دوو منداڵەی کە وەکو ناوەکانیان جوان بوون بە بیستنی هەواڵی مردنیان تووشی شۆك بووم. ئێستاش هەست بەو ئازارەی ئەو کات دەکەم.

بەو جۆرە کاتێ ئەو هەواڵە پڕ ئازارەمان لە نیلوفەر خانی خۆشەویستەوە پێگەیشت.. هەرگیز ئەو ڕووە پڕ لە میهرەبانی و سۆزەی لەبیر ناکەم. ئەو هەواڵە بە ئازارە.. هەستەکانمی گڕ تێبەردا.. ئەو ڕووداوە دڵمی ملیۆنان جار پارچە پارچە کرد..

ئەی دایکم و باوکم.. وشەیەك نادۆزمەوە بۆ باسکردنی ئەو ئازارەی ئەوان چەشتیان...

لەگەڵ ئەوەشدا باوکی نەخۆشم وای لێهاتبوو کە نەیدەتوانی لەجێگەی هەستێت. دایکیشم هۆشی نەمابوو، لە قسەی کەس تێنەدەگەیشت، کەسیش نەیدەتوانی لەو تێبگات.

لە ناو خێزانەکەدا هەموو ڕۆژێك ئازارەکان بەردەوام بوون.

## خوێندنگەی خۆبەخشەکانم بەدەست هێنا:

من خوێندنی سەرەتاییم تەواو کرد، بە هاوکاری خێرخوازەکان لە تاقیکردنەوەی خوێندنگەیەك سەرکەوتووبووم. لەوێ دەتوانم بخەوم و هەموو خەرجیەکانیشم لەلایەن خوێندنگەوە بوو.

مامۆستا نیلوفەر ڕازی نەبوو بە ڕۆیشتنم بۆ ئەو خوێندنگەیە بەڵام من زۆر مەبەستم بوو بچم. بەجۆرێکی تریش نەمدەتوانی بخوێنم.

یەکەمین هەنگاوم بەرەو ئەو ساڵانەی کە وادەزانم تیایاندا ون بووبووم، بەرەو بێ ئیمانی و بێ دینی نا.

ماڵئاواییم لە باوکی نەخۆشم و دایکم و دوو خوشك و براکەم کرد. بە نارەحەتی زۆری غوربەت لە ناخمدا و بە ئازارەوە شارۆچکەکەم بەجێ هێشت.

ئیتر لە شارێکی گەورەو خوێندنگەیەکی دەوڵەمەند، لە هەوایەکی سەرگێژکەری پۆلی یەکەمین دابووم.

زۆر کەشخانە، زۆر لە بەرزی دەژیاین. هەموو پێویستیەك لەبەردەممان ئامادەبوو.

بەڵام ئەو ڕاهاتنەی بەو گەرمی خۆشەویستیەی ماڵەوە گرتبووم، ئەو میهرەبانیە بێ ئەندازەیەی نیلوفەرخان لێرە نەبوو.

هیچ کەسیش باسی ئیمان و دینی نەدەکرد. تەنانەت پروپاگەندەی بچووك بچووکیش دەستی پێکردبوو لەبارەی حەزرەتی عیسا، ڕۆحی پیرۆز، شارستانیەتی ئەورووپی و بیروباوەڕی مەسیحیەت...

هەتا لە دیمەنی زیاترو زیاتریش دا دەوری جیاجیامان پێ دەدرا.

هەر ساڵێك کە تێئەپەڕی لەساڵی ڕابردوو لایان شیرینتر دەکردین.

لە پشوودا ئێمەیان دەبردە دەر، ئاگاداریان دەکردینەوە "ئەوان نەفامن، مرۆڤی نەخوێندەوارن، ئێوە گوێ بۆ ئێمە بگرن

بۆ خێزانەکانتان نا" بەم زۆرکردنە مێشکیان پڕ دەکردین. لە پێشمدا ئامانجێکی زۆر سەرنج ڕاکێش هەبوو:

ئەگەر سەرکەوتووبووبینایەو لەو جۆرەی ئەوان دەیان ویست خۆمان ڕابهێنایە، دەنێردراینە دەرەوەو لە خوێندنگەی باش بەدڵی خۆمان دەمان خوێند، لە دواییدا بەشێوەیەکی جیاواز دەمان توانی بگەڕێینەوە وڵاتەکەی خۆمان.

بێگومان ئەوەی زۆر خەیاڵی بەمەوە دەکرد من بووم. کە بۆ بەدیهێنانی ئەوە شەو و ڕۆژ تەقەلام دەدا. ئامانج و مەبەستیشم لەو ڕۆیشتنە ئەوە بوو ببمە هاوکاری خێزانەکەم و لەو ڕۆژە ئازاراویانە بیان هێنمە دەر.

بەلام زۆر درەنگ هەستم بە شتێك کرد، خوێندنگە بە هەوڵ و لێزانیەکی زۆر ئێمەیان لە شوناس و کلتورو بیروباوەڕی خۆمان هەنگاو بە هەنگاو دادەماڵی. بەلام هەلبژاردنێکی تریشم نەبوو.

کاك ئەحمەد تەنها چیرۆکی پڕ پەندی باس نەدەکرد، بەڵکو ڕووی شاراوەی ئەوانەشی پیشان دەدایــن کە لەژێر ناوی "خوێندن و پەروەردە"دا بە مەرامە گڵاوەکانیان مێشکی گەنجی کۆمەڵگەکەمانیان بەنج دەکرد.

ئەمە بەڕاستی بەسەرهاتی ژیانێکی گرنگ بوو. ئێمەش بۆ زانینی سەرەنجامەکەی زۆر بەچێژو سەرنجەوە چاوەڕێ بووین..

ئەو بەردەوام بوو لە گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە ئەفسوناویە:

خوێندنگـــەم بـــە پلـــەی بـــەرز تـــەواو کـــرد. بەڕێوەبـــەرو سەرپەرشتیارەکان بۆ من چیان نـەکرد. !.. منیـان وەکـو ڕیکلام لەبەردەم هەموو سەرکەوتووانی خوێندنگەکانی تردا نمایش کـرد. بێ شك کە لە لایەنی ماددیشەوە منیان تێرکردبوو. بـەڵام لـەڕووی دەروونیەوە ئەوەندە خۆیان بێ نیاز نیشان دەدا، تا ناخ و ڕۆحـی منیان بەجۆرێك بەتاڵ کـردەوە کـە ئـیتر لـە چاومدا کەسـایەتی و شوناس و بیروباوەڕو بەها کۆمەڵایەتیەکانیان هێواش هێواش لە لا بچووك کردمەوە.

ئەمەش کەسایەتی و ناسنامەیەکی تری بە من بەخشی.

کردمیە گەنجێکی دابڕاو لە مێژوو و بەها کلتوری و گرنگیەکانی دین و ئیمان، کە هەموو شتێك لە ماددەو دبلۆمدا دەبینێت.

## زۆر گۆڕدرا:

وەکـو جـاران کۆسـپەکانی مەملەکـەت و وڵاتەکـەم نـاخمی نەدەسووتاند، ئازارە بێ ئەنـدازەکانی خێزانەکـەم دڵـی ناڕەحـەت نەدەکردم.

لە دەروونمدا خەریك بوو ڕۆحێکی سـارد وەك سـەهۆڵ دروسـت دەبوو.

لـەدوای سـاڵێك تێپـەڕبوون لـەو زنجـیرە ڕووداوانـەی ئـەمریکا. گەیشتبوومە جێگەیەکی گرنگ. لـە زۆرێك زانکۆ داوای وەرگـرتنم کرد بەپشتیوانی پارەیەکی زۆرەوە دەستم کرد بە وانە وەرگـرتن.

لەلایەکی تریش لە کەرتێکی تایبەت ئیشم دەکرد. ئەگەر پێویست بێت کارزانێکی ئەکادیمیو، ناوبانگێکی باشم لە زانستەکەمدا هەبوو، ئەگەریش ئەمانە نەبێت بەو پارەیەی ناو بانك کە هەمبوو لە ژیانێکی پلە بەرزدا کە خەیاڵیشم نەکردبوو دەژیام.

لەماوەی تێپەڕبوونی ئەو هەموو کاتەدا زۆر لە مەراقی خێزانەکەمدا نەبووم. تەنانەت بە مردنی دایکیشم زۆر نەسووتام.

وەك بڵێی میهرەبانی و بەزەیی لە دەروونمدا نەمابوو، هەستەکانم وەکو کەڕیان لێ هاتبوو نەیان دەبیست..

کاتێ گەڕامەوە بۆ وڵاتەکەم و سەردانی شارۆچکەکەمانم کرد، وەك بڵێی ئەو یادگاریانە هی من نەبوون. خەریك بوو بێزاریان دەکردم.

پێشتر بەبیستنی دەنگی بانگی مزگەوتە بچووکەکەی تەنیشتمان چەندە بە پەرۆش و خۆشیەوە ڕام دەکرد. بەڵام ئێستا هەمان بانگ بێزاری دەکردم و دەموت "تۆی وازبێنە! ئەم بانگەش ژاوەژاو زۆر دەکات"...

ئەمە چ ئازارێکە! من گەیشتبووم بەو کەسەی خەڵك پەنجەیان بۆ ڕادەکێشا وەکو "زانا"یەك، بەڵام وەکو "پیاو"ێك کەسایەتی خۆمم لەدەست دابوو.

چونکە ئیتر بەهاکانی خێزان و خۆم، وەفا، ترس لە خوا، لێپرسینەوەی قیامەت هیچ کاریگەری لەسەرم نەبوو.

بەداخـەوە کەوتبوومـە حاڵێـك کـە هـەموو شـتێکم بـە مـاددە دەبینی و نکوڵیم لە هەموو بەها ئیمانیەکان دەکرد.

ئـەو حـاڵی نەخۆشـیە بەردەوامـەی بـاوکم لەسـەر جێگـاو ئـەو خۆشەویسـتی و حەسرەتی چـاوەڕوانیەی خوشـك و براکـانم، ئـەو گرنگیە زۆرەی خزمـەکانم لـە ڕۆحمـدا کـەمترین جووڵـەی دروسـت نەدەکرد.

زۆر بێزار بووبووم. یەك هەفتە وەکو یەك ساڵ لێم دەڕۆیشـت. هـەر چـۆن بێـت دەمویسـت بگەڕێمـەوە ئـەمریکاو لـەو کلتـورە ڕۆژهەڵاتیـە بێزارکـەرە ڕزگـارم ببێـت. چـونکە لـەو کلتـوورەدا خوونەریت هەبوو، یاساو وەفا هەبوو.

منیش کە مرۆڤێکی ئـازاد بـووم ئـەوەی کـە دەمـوت دەمکـرد، نەمدەویست هیچ کەس بێتە ناو ژیانمەوە.

لـەماوەی هەفتەیەکـدا خواردنـەوەم و جگەرەکێشـانم لـە هـەر جێیەك پێم خۆشەو چوونە دەرەوەی شەوانە لەگەڵ دۆستـەکانمدا دنیای ڕەش کردبووم. دەبوو هەرکەس ژیانی خۆی بژی.

من باری هیچ کەسم هەڵنەدەگرت. بۆ ژیانی هـیچ کەسـێکی تـر ڕێگەم نەدەدا ژیانی خۆم بێزارو بێتاقەت کەم.

کۆتـا ڕۆژم بـوو لـە شارۆچـکەکە. ڕۆژێـك دواتـر دەگەڕامـەوە. ئێوارەکەی باوکم نەخۆش کەوت، بردنە شاری ئەویش کەوتە سـەر من. پزیشکەکان کاری پێویستیان کرد بەڵام کارەکە تـەواو ڕاسـت

بوو.. له تەنیشتم خوشکەکەم سایدەو براکەم حسین بەترسەوە وەستابوون. کاتێك ئەوانم لەو حاڵەدا بینی. بەراوردم کردن بە خۆم، "باشە من بۆچی ئاوا نیم؟!" .. لەگەڵ ئەوەدا کە باوکم لەهەموویان زیاتر منی خۆش دەویست. بۆئەوەی خۆم نیگەران نەکەم. لەسەری نەمامەوەو ڕۆیشتم. بەلام لەناخمدا هەستێك کە لەم ساڵانەی کۆتاییمدا تەنانەت بیریشم لێ نەکردبووەوە دروست بوو:

"ئایا من کوڕی ئەو ماڵە نەبووم؟!"

بەڵێ، من کوڕی ئەو ماڵە بووم. برای ئەم دوو خوشك و برایە بووم کە لەبەردەمی باوکمدا دەگریان و دەیانناڵاند.

کوڕی ئەو پیاوەش بووم کە لە ڕۆژەکانی کۆتاییدا بە فرمێسك ڕشتنەوە پێی وتم "تەنها ئومێدم تۆیت کوڕم، سەرەتا خۆت، پاشان ئێمە ڕزگار بکە".

بەڵێ زۆرم هەوڵ دا. خۆشم ڕزگارکرد. بەلام ئەی خێزانەکەم؟ ئایا ئەوان بۆ من گرنگن یان گرنگ نین؟!

ئایا نیگاکانیان بۆ ژیان لای من بەهای هەیە؟!

ئەگەر ژیانی من لە سەختیدا بوایە تۆ بڵێی خێزانم چەندە لێمەوە نزیك بوونایە؟! ئەی بۆچی من ئەو خۆشەویستی و سۆزە نیشان نەدەم؟! یان لەبەر ساردبوونەوەمە لە بەها کلتوری و بیروباوەڕەکانم..!

## ئەو شۆکەی ئەوی گۆڕی:

لە یەك چرکەدا مێشکم گۆڕا بە مەیدانی جەنگ. وەکو بڵێی لە چەند چرکەیەکدا خۆمم ون کرد، لەبیر خۆم چوومەوە..

بە تۆنێکی قورس کە لە مێشکمدا تەقیەوە: "تۆ کێیت؟"

بەڵێ، من کێ بووم؟ بۆچی دەژیام؟ ئەگەر وەکو باوکم بکەوتمایەتە ساتەوەختی مردن و نزیك بوونەوە لە مەرگ و چوونە ناو خاك چیم بەسەر دەهات؟!

بەڵێ من دەبووم بە خۆڵ، لە تەمەنی گەنجیمدا دەمردم.

بەڵام من هێشتا خەیاڵم هەیە کە بیانهێنمە دی. من دەبوو زۆر بژیم. باشە ئەمەم چۆن دەپاراست؟!ئایا توانای ئەمەم هەبوو؟ ! لەکاتە کۆتاییەکانی باوکمدا، منیش لێپرسینەوەی خۆمم دەکرد. ئەمەش لە مێشکمدا گەردەلوولی پڕ ماناو تووڕەیی دروست دەکرد.

لە لایەك حسێن و لەلایەك سایدە لە پشت باوکمەوە قورئانیان دەخوێند. منیش وەك ئەوەی کوڕی ئەم کلتورە نەبم خۆم وەکو بیانیەك هەست پێ دەکرد.

لە تەنیشت باوکم دانیشتم. لەناکاو چاومان کەوتە سەریەك. ئای خوایە ئەوە چۆن سەیرکردنێك بوو! وەکو ئەوەی پرسیارێکی بەئازاری لە من دەکرد. "کوڕم تۆ چیت بەسەرهاتووە؟!"

بە دەنگێك کە بە زەحمەت لێی تێدەگەیشتم:

– کورِم. من ئیتر دەڕۆم. بەڵام شتێك لەتۆ دەپرسم.

– فەرموو باوکە.

– کورِم بە من دەڵێیت ئایا من هیچ کات درۆم لەگەڵ کردوویت؟

لەوکاتەدا ژیانی باوکم هەموویم هاتە بەرچاو. باوکم ئەوەندە میهرەبان، ئەوەندە پڕ لە هەست و ڕاستگۆ بوو، ئەگەر هەڵەیەك یان درۆیەکی بچووك لە دەمم دەربچوایە یەکسەر تەوبەی پێ دەکرم و هەرگیز ڕێی نەدەدا ئەو هەڵەیە دووبارە بێتەوە. ئیتر لەبەرئەوە زۆر بەبێ گومان وەڵامم دایەوە:

– نەخێر، باوکە.

– کەوایە قسەکانم هەموو کات ڕاست دەرنەدەچوو؟!

– بەڵێ باوکە.

چاوەکانی کەمێك داخست و پاشان کردیەوە. ئەو ڕستانەی وت کە دنیای منی سەرەوژوور کرد.. هەروەها لەگەڵ فرمێسك ڕشتنی سەر گۆناکانیدا..

– کورِم، من ئێستا خەریکم ئەو شوێنە دەبینم کە بۆی دەچم. خوا دەرگای بینینی ئەو دنیای بۆ کردوومەتەوە. هیچ کات لە مێشکتی دەرمەهێنە کورِم.. خواو قیامەت هەیە ئەوێش ژیانی ئێرەی بۆ دەنێردرێت.

چی دەبێت کوڕم ئەمە کۆتا تکامە لە تۆ.. بەرلەوەی دوا هەناسەم بدەم ئیمانت تازە بکەرەوە.. من نامەوێت بڕۆم و لە پشتمەوە نەوەیەکی بێ ئیمان بەجێ بهێڵم، ئەگەر بەم جۆرە بڕۆم دەبێتە گەورەترین ئازاری ئەو ژیانەم. "کوڕم ڕوو بکەرەوە خواو بۆلای بگەڕێرەوە" .

لەگەڵ باوکم کە دوا شایەتومانی هێنا دووبارەم کردەوەو ئیتر سەری باوکم کەوتە سەر کۆشی من.

بەجۆرێك لەوکاتەدا یەك گرِیان لە دەروونمدا تەقیەوە.

## کڵپەی ئەو ئیمانەی لە ناخمدا دەسووتا:

هاوارم کرد:

– خوایە ئیمانم بە تۆ هەیە، تۆ هەیت..

ئەو دەنگ و هەرایە، ئەو گێژەڵوکەیەی هەموو دونیامی کردبووە مەیدانی جەنگ ئەوەندە بەهێزو سەیربوو، کە ئیتر دوای ئەوەم بەبیر نایەت. کە هاتمەوە هۆش خۆم لەسەر جێگایەکی نەخۆش ڕاکێشرابووم. لەپشت سەرم پزیشکێکی سپی پۆش وەستابوو. پێی وتم:

– خوا شیفات بدات.. ئەم ڕووداوانە زۆر سەخت لێمان دەگوزەرێت. ساتی مردن ئاسان نیە، خودا ژیانێکی بەخێرو جێگای باشت بەنسیب بکات.

پزیشکی سیما نوورین و زمان شیرین بەرلەوەی من بپرسم خۆی وتی :

– پێویست بەهیچ چارەسەرێك ناكات. هەتا پشت بەستن و باوەڕتان زیاد كات بەرگریشتان زیاد دەكات. ئێوە كارەكانتات بسپێرن بە دادوەری گەردوون. چونكە ئێوە تەنها بەندەی ئەون، پلانەكان بەدەستی ئەون.

وەك ئەوەی پزیشك ناخمی خوێندبێتەوە. ئەوەندە بە ماناو مەبەستەوە وشەكانی ئاسوودەیان دەكردم. وەكو ئەوەی بڵێت :

"واز لەو بێ دینی و بێ ئیمانیە بهێنە، ئیتر وەرەوە بە خۆتدا."

یادەوەریەكانی كاك ئەحمەد ئێمەی لەخۆمان دەبرد. ئەوەی گوێی بۆ ئەو هەموو بەسەرهاتە بەئازارانەی ئەو ژیانە دەگرت تەنها ئێمە نەبووین. بەڵكو هەموو ئەو كەسانەی دەوروبەریشمان بە سەرنجەوە گوێیان گرتبوو. خانمێكی خزمەتكاریش كە بە كارێكی خۆی هاتە ئەو دەوروبەرە، ئەوەندە سەرنجی ڕاكێشابوو بەجۆرێك نەیدەتوانی جیاببێتەوە.

كاك ئەحمەد بەردەوام بوو:

– باوكمان ناشت.. وەك ئەوەی ئەو كەسەی نێژرا باوكم نەبوو، من بووم. لە حاڵێكدا بووم كە هەموو دنیام بەسەردا ڕووخابوو. لەسەرسوڕمان و دوودڵییەكی گەورەدا نەمدەزانی چی بكەم و چۆن و لەكوێوە دەست پێ بكەم.

من زانایەکی بەناوبانگی بێ ئیمان بووم. ژیان و یادگارییە کۆنەکانم بە قەڵەمێك بۆ لانەدەبرا. بەڵام دوا داواکاری باوکیشم لەگەڵ کۆتا هەناسەیدا ڕۆحمی مەست کردبوو.

باشە من ئێستا دەبوو چی بکەم؟ لە کوێوەو چۆن دەست پێ بکەم؟ لە ئەستەنبوڵ هاوڕێیەکی ناسراوم هەبوو. ئەو کەسێك بوو سەرەڕای ژینگەی خوێندنەکەشی، کەسایەتی و کلتوورو باوەڕەکەی بە پارێزراویی هێشتبوویەوە. تەلەفۆنم بۆ کردو باسی حاڵی خۆمم بۆ کرد.

ئەو وەڵامەی زۆر سەرنج ڕاکێش بوو:

– هەر ئێستا لەو دەورووبەرانە دوورکەوەرەوە... ئەگەر ویستی گەڕانەوەی تۆ زیاد بکات ڕەنگە بکەوێتە سەر زمانی خەڵك. لە ئێستاوە لەسەر بابەتی نوێژو خواو ئیمان و پێغەمبەر لە دەرگای هیچ کەس مەدە، لەبەرئەوە پێویستە کەسانێك لە ئاستی خۆت بدۆزیتەوە کە پەیت پێبەرن. ئەگەر ئەم هەڵبژاردنەت بەباشی نەکەیت، هەندێك کەس ڕەنگە ئەو پێویستبوونە مەعنەویەی کە تۆ دەتەوێت نەیبەخشن پێت و ساردیشت بکەنەوە.

پێویستە سەرەتا لە دنیای دڵ و دەروونتدا زەمینەیەکی باش ساز بکەیت. ئەگەر مرۆڤ بۆ بەندایەتیکردنی، باری دەروونی بەتەواوەتی ئامادە نەکات ئەوا ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کەم ئەو هەست و جۆش و خرۆشە بەردەوام بێت و دوایی تەواو بێت. بۆ

بەردەوامی و کۆتایی نەهاتنی ئەمەش تاکو هەمیشە تێربیت لێی پێویستە لەسەرچاوەی ئاوەکە بخۆیتەوە.

## داواکاریەکی زۆر سەیر:

- واتە؟

- دەمەوێت بچیتە حەج یان عەمرە. باوەڕم وایە ئەگەر بچیتە ئەوێ و لەو هەوایەی ئەو جێگانە هەناسەیەك بدەیت تەوبەو گەڕانەوەیەکی ڕاستەقینەو بێ گومان بکەیت.

- ئایا !.. ئایا شتی وادەبێت! کەسێك کە لە سنوری خواو ئیماندا جوولەیەکی نەکردبێت بچێتە حەج دەبێت چی بکات؟! بەڵام بڕیارم بە خۆم دا .. کە بیرم لەو بیرۆکەیە دەکردەوە گەرم دادەهاتم:

" ئەگەر خودا هەبێت لەو جێگایانەدا دەبێت نیشانەیەکم نیشان بدات کە دەبێتە هۆی پەشیمانیو گەڕانەوە. ئەگەریش نەبێت "حاشا" ئەوا وەکو سەردانێکی گەشتیاری لێدێت".

ئەم نزیکبوونەوەیەمم پەسەند کرد. بۆ ڕۆیشتن بۆ حەج هەوڵم دا. سەیری ئەو نسیبە بکەن، زۆر جوان بوو. لەگەڵ گروپێکی تایبەت ڕێککەوتم و ڕۆیشتمە حەج.

تەماشای کاری ئەو خودا مەزنە بکەن. هاوسەفەری ڕێگەو ژوورەکەشم زاناو نووسەرێك بوو. واتە لەگەڵ زاتێك هاوسەفەربووم کە دەیتوانی لە دنیای من تێبگات.

نازانم چۆن ئەو شتانەتان بۆ باس بکەم کە تیایاندا ژیام؟!
چۆن باسی جوانیەکانی ئەو هەرێمە مەعنەویەتان بۆ بکەم! چۆن هەوای مرۆڤ پاکژکەرەوەو سەرسوڕهێنەری مەککەو مەدینەتان بۆ بهێنمە سەر زمان؟!

ئەوێ ئەوەندە جێگەیەکی ئارام بوو. ئەوەندە نزای وەرگیراو و ئەوەندە پاڕانەوەو ئەوەندە سەردانی زاتی پاك و بەرزی تێدا کرابوو، کە مرۆڤ لە بینینی ئەو جوانییانە تەواو سەرخۆش دەبوو.

منیش لەناخمدا دەموت و دەپاڕامەوە: "چی دەبێت خوایە گیان ئەو هەستە بێ وێنانە لە منیشدا بژێنە، منیش بخەرە ئەو جیهانە ئەفسوناویانەوە".

لە دەمی کاك ئەحمەدەوە ڕژانی هەنگوین بەردەوام بوو. ئێمەش بەتەواوی هەناسەمان گرتبوو. گوێمان دەگرت:

– کە چووینە ناو مەککەوە، من ئیتر لە پەیوەندیم لەگەڵ دنیایەکی جیاوازی تردا هەستم بە ونبوونی خۆم دەکرد.

ئەو هەناسانە تەنانەت ئەو هەوایەی ئەوێ ، ڕۆحی دەژیاندەوە.. ئەو هەستە گەرمانەی ئەوێ دەروونی فێنك دەکردەوە.

لە ئوتێلەکەمان نیشتەجێ بووین. ئەو هەڵسوکەوتی نزیکیی و گەرم و گوڕی نواندنەی هاوڕێی ژوورەکەشم کە بەرامبەرم هەیبوو ئەوەندەی تر کاری تێدەکردم.

## دنیای گەورە:

بـەڵام چـۆن باسـی ئـەو هـەوا فراوانـە و ئـەو مرۆڤـە سەرسوڕهێنەرە بکەم کاتێ چووینە ئیحرام بەستن و تەوافی کەعبە! ئـەو هەسـتە نـەبینراو و ئـەو حەسـرەتە کتـوپڕەی لەناخمدا دروست دەبوو چۆن بهێنمە سەر زمان؟!

لە ئوتێلەکەماندا نزیکی کاتژمێرێك پاڵکەوتم تـاکو پشـو بـدەم. لەو ماوەیەدا چاوەکانم ڕامان و مێشکیشم لە خەیاڵدابوو.

ڕووخساری دایکم هاتە پێش چاو..

بەو ڕووە شیرین و میهرەبانەیەوە کە پێی وتم:

"کوڕم منیشـت لـەبیر نەچـێت، نـزا بـۆ منـیش بکـە" یەکسـەر هەستامە سەرپێ... لەوانەیە ئەوە یەکەمین جار بووبێ ئەوەنـدە دڵم سووتا لەبەرامبەر دایکمدا.. ئەو بێ ئەوەی هیچ پشوویەك لـەم دنیایـە بـدات ڕۆیشـت. لەوانەیـە منێـك دوای ئـەو هـەموو گونـاهو هەڵانەم بەهۆی دوعا وەرگیراوەکانی دایکمەوە بێت کە پێم ناوەتە ئەم جێگە پیرۆزانە.

– ئاه دایە گیان ئاه!

لەهەر جێیەك دەنگی دایکێك دەبیستم دڵم دەکوڵێ، وەکـو لـە ئاگری تەنوردا..

ئەو چیرۆکەی کاك ئەحمەد چەندە لەوەی من دەچوو.. ڕەنگە هۆی سەرەکی هاتنی منیش بۆ ئەم ڕێگەو جێگە پیرۆزانە نزاو پاڕانەوە بەکوڵەکانی دایکم بووبێ کە لە دڵەوە دەیکردن بۆم.

مانای وایە دایك و باوکەکان ئەوەندە بەڕاستی و ئەوەندە لە دڵەوە نزا بۆ نەوەکانیان دەکەن و نزایان بۆ دەخوازن کە خوای گەورەش نزا ڕاستیەکانیان ناگەڕێنێتەوە.

ئاه.. دایە.. ئاه! ئەگەر بزانیت لە نەبوونی تۆدا چیم چەشتووە.. ژیانی بێ تۆیی چەندەی فیێل و تەڵەکە بەسەرهێنام ئەگەر بیبیستیت...

بەڵام شکور بۆ خودام کە ئەم ڕێبوارەی کردە نسیبم. مانای وایە ئەم چاکەیەی خوای گەورە، لەبەر ئەو پاڕانەوەو نزایانەی تۆ بووە کە خوا بەنسیبی کردم.

کاك ئەحمەد لە گێڕانەوەی یادگاریە پڕ لە هەستەکانی بەردەوام بوو:

- لەگەڵ هاوڕێکەم ڕۆیشتینە لای کەعبە.

خودایە چ دنیایەکی سەرسوڕهێنەر بوو! لەباسکردن نەدەهات.. کاریگەری ئەو هەوایەی ئەوێ لەسەر ڕۆحی مرۆڤ چ عەشق و هەستێکی دروست دەکرد.

ئەوێ تەنها دنیایەك نەبوو.. بەڵکو دڵی هەموو موسوڵمانان بوو. کە لەناو دڵی مرۆڤدا لێی دەدا...

لەناو ئەو قەرەباڵغیە مەحشەریەدا نقوم بووین.. لەپێشمەوە هاوڕێکەم و منیش بەدوای ئەودا.. هاوڕێکەم لەبەرئەوەی پێشتر هاتبوو، تەواو بۆ من وەك ڕابەرێك وابوو.

دەورووبەرمان پڕبوو لە بەرزبوونەوەی دەنگی هاوارو پاڕانەوەو نزاو تەوبەکردنی کەسانێك کە ئاوی دڵەکانیان هاژەی دەهات... دوای ئەوەی چەند هەنگاوێکمان نا، لەبەرامبەرماندا کەعبەی بێ ئەندازە سەرسوڕهێنەر دەرکەوت.

## ماڵی خودا :

ئەوێ ماڵی خودایە.. ئەوێ ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەر چۆکی لێ داوە... ئەوێ ئەو شوێنەیە کە هاوەڵان و زانایان و زاتی بەرز تیایدا پاڕاونەتەوەو فرمێسکیان ڕشتووە.. ئەو مەملەکەتەیە کە نزای تیا ناگەڕێنرێتەوە.

به ملیۆنان کەس بە دەوریدا دەسوڕێنەوە "لبیك" دەڵێن.

به ملیۆنان کەس دەستیان بەرز کردۆتەوەو "خودایە ئاشتمان کەرەوە" دەڵێن.. به ملیۆنان دەرگای دڵیان کردۆتەوە "خودایە بمان بەخشە" دەڵێن..

فەرموون لەو هەوایە تێر ببن...! چۆن تێر دەبن؟ منێکی گوناهبار کە بەو جۆرە سەر سوڕماو و خرۆشاوم، بیرم لە ئەویندارانی خواو پێغەمبەر دەکردەوە دەبێت حاڵیان چۆن بێت.

زیاتر بەرگەی ئەو هەستانەی خۆمم نەگرت کە دڵیشم بۆ ئەو خۆشەویستەم لێی دەدا.. دەمووت "خودایە! بەندەیەکی گوناهباری وەکو من هاتۆتە دەرگاکەت. چی دەبێت تکایە منیش قبوڵ بکە".

ئەو جێگە سەرسوڕهێنەرە، ئەو هەوا ئەفسوناویە، ئەو دنیا پڕ نهێنیە منی بەجۆرێك لەئامێز گرتبوو کە هەموو گەردیلەکانی گیانم تەنها یەك ڕستەیان دەوت "خودایە لێم خۆش بە، خودایە لێم خۆش بە" لەگەڵ هاوڕێکەم یەکمان لەباوەش گرت.. "خودایە چی دەبێت ئێمە لەخۆت دوورمەخەرەوە.. ئێمەش بخەرە ڕیزی ئەوانەی پێیان دەڵێیت لێتان خۆش بووم". "چی دەبێت گوناهەکانمان بسڕەوە تا پاك نەبینەوە لەم جێگەیە دوورمان مەخەرەوە" .لەتۆ زیاتر دەرگایەکمان نیە، ئومێدێکمان نیە، لەتۆ زیاتر تکایەکمان نیە... چی دەبێت خودایە.. چی دەبێت...

لەدەوری کەعبەو لەنێوان سەفاو مەروەدا بە چەندین کاتژمێر چۆکمان دادەداو دەپاڕاینەوە لە گەورەی هەموو گەورەکان... مەگەر گەورەترین شیرینی و دڵخۆشی و زۆرترین پشووی ڕۆحی مرۆڤ لە فرمێسك ڕشتن و سەردانەواندندا نیە بۆ خوای خۆی!..

ئەو ماوەی دە ڕۆژەی لە مەککە بووین، هەر لە دەوروبەری کەعبە بووین، هەموو چرکە ساتەکانیمان هەڵمژیە ناوناخمانەوە، هەموو کاتەکانمان تیایدا تواینەوە..

ئەو ماڵی دنیاییەی کە دەوترێت، بەچەند دەنک خورماو چەند قوم ئاوی زمزم تێگەیشتین..

بەجۆرێك دڵ و ڕۆحمان لەو هەوا نەبینراو و هەست پێنەکراوەی کەعبە کاریگەر بوو. دەبێت "تەوبەو گەڕانەوە" کە دەیانوت، هەر ئەمە بێت...

ئێمە لەو هەوا مەعنەویەدا ڕاستیەکانی ئیمان و قورئانمان دۆزییەوە، حەزو چێژی ئیسلاممان دۆزییەوە، لە هەمووشی گرنگتر خۆمانمان دۆزیەوە.. مەگەر گرنگترین شت لە ژیانی مرۆڤ دۆزینەوەی خۆی نیە!..

بەڵام هێشتا ڕاستیەکانی ئەو جیهانەی وەکو خەون و خەیاڵ بوو تەواو نەبووبوون.. لەدوای عەرەفات کە تیایدا گوناهەکان دەتوێنەوە، دنیای سەروەرمان "مەدینە" هەبوو...

## جۆش و خرۆشێکی سەیر:

ئەو گەرم گوڕی و خرۆشانەی ئەوێمان پێش چەند ڕۆژێك بیست..

کاك ئەحمەد باسی دەکردو ئێمەش هەندێك جار وەکو منداڵ خۆمان پێڕاناگیرێت، هەندێ جاریش لەسەر کورسیەکانی ناو فرۆکەکە دەتوێینەوە.بینینی ئەو جێگە پیرۆزانەی کە تەنانەت خەیاڵەکانی مرۆڤیش دەخرۆشێنێت. کێ دەزانێت دەبێت چ خۆشبەختیەك بە مرۆڤ بدات؟!

هەستە بزواو و فرمێسکە وشك نەبووکانی ئۆزلەم خان و نورای خان لەلای ڕاست و چەپمەوە لەناو ملکەچی زۆری گێڕانەوەکانی کاك ئەحمەددا جوانی و شیرینیەکی جیاوازی دروست کردبوو.

دڵمان وەکو باڵندەیەکی گیراوی لێ هاتبوو لەلایەن ڕێویەکەوە کە دەیەوێت هەڵبێت و بفڕێت... خودایە ئەو خرۆشانە چی بوو؟ وەکو ئەوەی بەهێزترین بوومەلەرزەی جیهان لێی دابن، ڕوخساری شێواو و هەستی بزواو و دەروونی سەرەوژوور کراومان ئێمەی گەیاندبووە چێژێك کە تا ئەو ڕۆژە نەمان چەشتبوو.

خودایە چی دەبێت، لەم جیهانی ئاسوودەیی و لەم دەروازەی خەون و خەیاڵە جوانانە ئێمە جیا مەکەرەوە.

کەمێك ڕووم وەرگێڕا بەرەو پشتەوە، ئەو دیمەنەی کە بینیم هیچ لەگەڵ ئەوەی ئێمە جیاوازی نەبوو.

کاك ئەحمەد دەستەسڕی بەدەستەوەبوو. کە بەسەرهاتەکەی بۆ ئێمە دەگێڕایەوە چاوەکانیشی دەسڕی. لەگەڵ ئەوەشدا دەنگە پچڕ پچڕ و لەرزیوەکەی هەستێکی سەیری دەردەخست کە بەڕاستی لەناخەوە قسەی دەکرد.

ئەی کاك مەتین و سەیدا؟!

لەڕاستیدا سەیدا وەکو ئەوەی لەهۆش خۆی چووبێ وابوو...

چاوەکانی سووربوو بوون و لێوەکانی دەلەرزین، فرمێسکە ڕژاوەکانی سەر گۆنای تەواو نەدەبوون. کاك مەتینیش سەری

داخست بوو لەو کەشە پڕ لە هەست و گەردەلولی حەسرەتەدا هەوڵی دەدا بەرگە بگرێت.

ئەم دیمەنەی ناو فڕۆکەکە کاریگەری لەسەر کێ دروست نەکردبوو؟

هەموو ئەو ڕێبوارانەی کە دەنگیان دەبیست، ئەو خزمەتکارانەی دەهاتن و دەچوون، هەموو ئەو خەڵکەی هۆگری بیستن بووبوون...

ئای خودایە چی دەبێت لەناو ئەم کەش و هەوا جوانەدا ئێمە وەرگرە، لەجوانترین گەشتی ژیانماندا دەستنیشانمان بکە. لە تێکەڵ بوونەوەمان لەگەڵ ئەو دنیایەی تر یارمەتیمان بدە تووشی گوناه نەبینەوە.

خودایە چی دەبێت، نزای ئەم بەندە گوناهبارەت قبوڵ کە..

لەناو دڵی فڕۆکەکەدا کە ئەو گفتوگۆ سەرنج ڕاکێشەی تیادا بوو، ڕەنگە ئەوە ڕازاوەترین هەڵفڕینی بووبێت. ئەو ڕێگەیەی بەرەو ئەو جێگە پیرۆزانەی دەبردین لەهیچ ڕێگەیەکی تر نەدەچوو. ئەو ڕێبوارانەی ناو ڕیزەکانیش مرۆڤ نەبوون.

ئەو ڕۆژە، ئەو کاتانە هەموان خرۆشابوون. دڵی هەموان بەجۆرێکی تر لێی دەدا، دەروونی هەموان لە بەهارێکی تردا دەژیا.

ئێمە بەتەواوی چووبووینە ناو باسەکانی کاك ئەحمەد دەیگێڕایەوە. جگە لەو دەنگەی ئەو هیچ دەنگێکی تر نەدەگەیشتە ناو گوێمان وەك دەڵێن "وەکو ئاو دەمان خواردەوە" . بەڵێ ئێمەش ئەو یادگاریانەی تێرمان لێ نەدەخواردن وەکو ئاو دەمان خواردنەوە.

کاك ئەحمەد بەردەوام بوو:

– ڕۆیشتنمان بۆ مەدینە، جیاوازتر بوو..

لەسەرەتاوە دیاربوو کە ئەم ڕێگەیەش چەندە جیاوازو لەبیرنەکراوە لەگەڵ ئەوەی کە بۆ من تەواو جیاوازبوو و گرنگی خۆی هەبوو. چونکە ئەو خەونەی لەکۆتا شەوی مەککەدا بینیم هەموو دنیامی دابوو بەسەر یەکدا.. چۆن لەبیری دەکەم؟ بە چ شڵەژاویەك لەسەر جێگاکەم هەستام؟! چۆن نایەتەوە بیرم ئەو گەرم و گوڕی تۆفانەی منی لە خۆم بردبوو؟ چۆن ئەوە لە مێشکم دەرکەم کە یەکسەر هاوڕێکانم لەدەورم کۆبوونەوە وتیان: "چی بووە؟"

## ئەو شەوە:

بەڵێ ئەو شەوە.. بەر لە دەرچوونمان بەرەو مەدینە..

لەڕاستیدا ئەو شەوە زۆر بە خەمباری و بێ تاقەتی خەوتم. ئاسان بوو بەجێ هێشتنی ئەو دیمەن و کەش و هەوایەی مەککە؟ ئاسان بوو ماڵئاوایی کردن؟! جیابوونەوە لەو جێگەیەی زۆرینەی

پێغەمبەران و لەسەروو هەموویان سەروەرمان "ألله أكبر" یان تیادا کردووە.

ئاسان بوو لە پشتەوە بەجێ هێشتنی ئەو کاتانەی دوعاکانیان تیادا قبووڵ بووەو نەگەڕاوەتەوە، هاوەڵان خوێن و گیانیان تیا بەخشیوە؟! ئاسان بوو جیابوونەوە لەدڵی مەعنەوی دنیا، کە دە ڕۆژە هەوا پڕ لە لە شیفاکەی دەکەمە ناو سیەکانمەوە؟!

ئەو شەوە.. شەوێکی جیاوازبوو...

لەبەرئەوەی ئەوە کۆتایی جیابوونەوەمان بوو، لای کەعبە چۆکمان دادابوو دەپاڕاینەوە.. "ئامین" مان کرد بۆ ملیۆنان دوعای کە لەوێ دەکران. لەگەڵ ئەو بەندە هەژارو نەخوێندەوارەی تەنیشتم کە دەستی کردبووەو دەپاڕایەوە "خودایە من نەخوێندەوارم خوێندنەوەو نووسین نازانم، نازانم دەبێت چۆن دوعا بکەم. چی دەبێت خوایە من هەڵەم کرد بمبەخشە" .

ئەوەندە کاریگەری لەسەرمان دروست کردبوو. ئێمەش دەمان وت: "خودایە لەبەر ڕێزی ئەو دوعایەی ئەو بەندە هەژارەت ئێمەش دووبارە بۆ ئەم جێگە پیرۆزانە بگەڕێنەرەوە.."

مانای ئەوەیە دوعای ئەو بەندە نەخوێندەوارە قبوڵ بوو و خواش ئێمەی دووبارە خستەوە سەر ئەم ڕێگەیە.

بەڵێ ئەو شەوە...

ئەو شەوە تەنها چەند کاتژمێرێکی کەم پشوومان دا و سێ یان چواری بەیانی کەوتینە ڕێ...

لەگـــەڵ هاوســـەفەرەکەم بەیەکـــەوە بـــووین.. ئـــەو کەوتـــە خوێندنەوەی "جەوشەن" منیش لەسەر جێگاکەم ڕاکشام. نیـو کاتـژمێر، خـەوم لێکـەوت یـان نـا ئـەو دیمەنـە سەرسـوڕهێنەرەم بینی...

کاک ئەحمەد وەکو ئەوەی دیسان ئـەو خـەوە ببینێـت بەرگـەی نـەگرت و دەسـتی کـردە گریـان.. ئـەو ئاگرە کەتـە نـاو هەسـتی ئێمەش ..

ئێمەش خۆمان پێ ڕانەگیراو لەگەڵ کاک ئەحمەد لـەو هەوایـەدا لە هۆش خۆمان چووین..

دەنگی سەیداش کە وتـی:"خودایـە بیکـەرە نسـیبی ئێمـەش" ئەوەندەی تـر کاریگـەرو سووتێنەر بـوو کـە هـەموو گەردیلـەکانی گیانمان "ئامین"ی کرد.

کاک ئەحمەد لەگەڵ دانە دانە ڕشتنی فرمێسکدا وتی:

– لەناو مەککەدا بووین، هەمووان سەریان بەرەو ئاسمان بـەرز کردبووەوەو بەرەو مەیـدانێك ڕایـان دەکـرد. بـەڵام مەیـدانێك بـوو لەناو ئەو لمی بیابانەدا، دارستان و مێرگ...

لەناوەڕاسـتی دا گردێکـی نـەبینراو، بینایـەکی زۆر جـوانی لەسەربوو کە چاوەکانی ئەبڵەق دەکرد.

هەمووان وەکو لافاو بەرەو ئەوێ دەڕۆیشتن... من و هاوسەفەرەکەشم پێکەوە ڕامان دەکرد بەرەو ئەو مەیدانەی ڕوناکیەکەی چاوەکانی دەبرد... بەڵام بۆ کوێ و بۆچی دەچووین نەمان دەزانی...

هەتا نزیك بووینایەتەوە دەنگ بەرزتر دەبوویەوە: "ئەم مەیدانە هی سەروەرمانە، لەوێ پێغەمبەرمان ئوممەتەکەی قبوڵ دەکات. بەڵام کردەوەی باش ئەنجام دەرئەکات".

لەو کاتەدا ئاگرێك کەوتە گیانم.. ئەگەر کردەوە باشەکان قبووڵ کات ئەی ئێمە؟ واتە ئێمە قبووڵ ناکات؟ چۆن قبوڵی کات، مرۆڤێك لەو تەمەنەی سەرپێچی خوای کردبێت و لە فەرمانەکانی دەرچووبێت چۆن دەکرێت پێغەمبەر قبووڵی کات؟

تۆ بڵێی لە میهرەبانی و سۆزیەوە نەڵێت "ئێوەش وەرن!" یان دەڵێت "ئەوانە دوورخەنەوە، لێرە چی دەکەن!"؟!

لەناخمدا شەڕێکی سەیر هەبوو.. ناتوانم باسی بکەم لەو هەستەی منی بێ دەرمان هێشتبووەوە. ئەو خرۆشان و گەرم و گوڕیە چۆن لەناو دەمارەکانمدا بڵاو بووبووەوە..

تێکەڵ بەو خەڵك و دەنگە بووین کە بەرەو ئەو جێگەیە دەچوون.. دەرگایەکی زۆر گەورە هەبوو..

ئەوەندە نزیك بوونەوەو قەرەباڵغی بوو، ئەوەندە سەرسوڕماوبوون هەمووان دەیانویست زوو بڕۆن و لەو دەرگایە

بچنە ژوورو بگەنە ئەو جوانیانەی ڕۆحەکان ڕۆشن دەکاتەوە، بگەنە خزمەت پێغەمبەر کە سەربەرزە بە هێندەی هەورەکان.

بەڵام لە دەرگاکەوە تەنها ئەوانە دەڕۆیشتن کە ناویان بانگ دەکرا...

من خۆم ڕانەدەگرت لەجێی خۆم، ئەوانەی ناویان دەخوێنرایەوە دەڕۆیشتن.... لەکۆتاییدا هاوسەفەرەکەشم بانگکرا.. بەڵام هەر چاوەڕوان بووم... چونکە من بانگ نەکرام و دواییش دەرگاکە داخرا.. لەخۆڕا نومێدەوار بووم. دوای ئەوەی بێگەردیی منداڵێکی گوندم واز لێ هێناو ڕووم لە دیك و باوکم وەرگێڕا، کلتورو باوەڕو خوام لەلایەك بەجێ هێشت و ژیانێکی جیاوازم هەڵبژارد، لەخۆڕا نومێدەوار بووم... ئایا ئەمە گونجاوبوو؟!

بێ گومان نەخێر.. پێغەمبەرمان کەسی گوناهبارو هەڵەکەرو پیسی وەکو من بۆچی بانگ بکات؟!.. ئێمە شیاو نەبووین.

## نومێدی منی خامۆش کرد:

ئیتر ئەکاتە خۆمم لەدەست دا.. وەکو بڵێی کاك ئەحمەد باسی منی دەکرد نەك خۆی.. وەسفی منی دەکرد کە تەمەنم لە حەرام کردندا بەسەربردووە. ئەوەی باس دەکرد کە چەندە هەڵەبووم کە خەیاڵم دروست دەکردو نومێدەواربووم...

چۆن دەبوو پێغەمبەر کەسێك قبووڵ بکات کە تەمەنی هەمووی لە درۆ و هەڵەو زیناو سەرپێچی دا بەسەربردبێت؟!

من لەخۆڕا ئومێدەواربووم، لە خۆڕا خەیاڵم دەکرد، من لە خۆڕا خۆمم هەڵدەخەڵەتاند.

ئەوەی شیاوی قورسترین سزایە ئێمە بووین. ئێمە شایستە بەوشوێنانە نەبووین. بەو پیسیەی ناخمان ئەوێشمان پیس دەکرد.

کەوایە ئەم سەفەرە بۆچی بوو؟! بۆچی هەر لە سەرەتاوە هاتینە سەر ئەم ڕێگایەی کە لێی نائومێدین؟

ئیتر هەر لەم کاتی تەواو ڕووخان و تەواوبوون و نائومێدیەمدا دەنگی هاواری سەیدا بەرزبوویەوە:

"گوناه و تاوانەکان چەندە زۆربن با ببن، ئەوەندە بەسە بەندە تەوبە بکات و ڕێگەی خوا بگرێت.. دەرگاکانی ئەو هەرگیز داناخرێت".

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا. ئەمە هەناسەیەك بوو کە لە کاتێکدا خەریك بێت بخنکێیت دەیکێشیت.

کاك ئەحمەد بەردەوام بوو لەو خەونەی کە دەروونمانی هەستاندبوو، هەستەکانمانی هێنابووە سەر زمان:

- من لە دنیای خۆمدا تەواو توابوومەوە. تەواو لەو کاتەدا بوو هاوسەفەرەکەم هات و بە زەردەخەنەوە قۆڵمی گرت.. وتی

"ببینه، کێ چاوەڕوانت دەکات؟!" .. بە پەنجە ئیشارەتی بۆ لایەك کرد، ئاوڕم دایەوە دایك و باوکم بینی... ڕام کردە لای دەرگاکە. بۆنە خۆشەکەی دایکم کە وەکو میسك بوو هەڵمژی و دەستە سپیەکانی باوکم ماچ کرد.. خودایە ئەمە چ یەکتربینینەوەیەکی بەرگەنەگیراوبوو.. باوەڕپێنەکراوبوو.. ئەمە چ جوانیەکی لەبیرنەکراو بوو!

بەرلەوەی من بپرسم دایکی میهرەبانم وتی : "ئێمە زۆر باشین کوڕم، سەروەرمان ئێمەی بردە لا خۆی. زۆرمان دوعا بۆ تۆ کرد. إنشاألله سەروەرمان تۆش قبووڵ دەکات چونکە دوعای دایك و باوك ناگەڕێنرێتەوە".

بەو هەستەی کە ناخ و دڵمی دەسووتاند بەئاگا هاتم، هاوارم کرد: "یا رسول الله منیش قبووڵ بکە!"..

نازانم چەندێك ئاگام لەخۆم نەمابوو.. کە هاتمەوە هۆش خۆم لەناو باوەشی هاوسەفەرەکەمدا ئارەقم چین چین دەڕشت.. سەروەرمان منی قبوڵ نەکرد، بەڵام ئەگەر زۆریش بچووك بێت نووری ئومێدێك هەر هەیە. مانای وایە دوعای دایکم و باوکم ناگەڕێتەوە إن شاء ألله ئەگەر ڕێیەکی دەربازبوون هەبێت، نووری ئومێدێك هەبێت لەسایەی دایك و باوکمدا دەبم.

گەورەترین بەخششی خوا بۆم ئەو هاوسەفەرەم بوو، مەگەر من لەگەل کێ دۆست و هاوڕێ و هاوسەفەر بووم...!

ئەو هەم زانایەك بوو، هەم كەسێكی كۆمەلایەتی و هەمیش یەكێك لە ئوممەتی پێغەمبەر كە بەر شەفاعەتی كەوتووە..

خودایە هەر ئەتۆی ئێمە بەپێوە ڕادەگریت.. چی دەبێت لەخۆت جیامان مەكەرەوە. چونكە جگە لەوە شەرەف و ڕێزو ئەتەكێتێكی تر نیە.

"دایكم" لەقولآیی ناخمەوە وتم "دایكە" تەنها ئومێدم تۆیت ئەو دوعا قبوولّ كراوانەی تۆ.. ئەو ژیانە پڕ نارەحەتیەت و ئەو نائومێدنەبونانەت لە خواو ئەو هەست و نزیكیانەت إنشاألله هەم خۆت ڕزگار دەكات، هەم دەبێتە هۆكاری ڕزگاربوونی منیش.. ئەگەر بزانیت ئەمەم چەندە لە خوا دەوێت دایكە.. ئەگەر بزانیت بۆ ئەمە چەند شەوم ڕۆژ كردۆتەوە.

ئەگەر بزانیت ئەو هەموو فرمێسكەی بۆم ڕشتووە.. نازانم خوا دەرگای خۆی لە من دەكاتەوە؟! دایكە ...!

## فرمێسكەكانی نەدەڕژان:

– گەشتی ژیانم.. ئەو شەوە كەوتینە سەر ڕێگەی مەدینە.

بەم جۆرە لەگەڵ فرمێسكەكانیدا بەردەوام بوو

بەدرێژایی ڕێگەكە بیرم لە پێغەمبەری سەروەرو حەزرەتی ئەبوبەكری صدیق دەكردەوە كاتێ لەناو زولّم و ستەمی كافرەكانی مەككەوە بەرەو دلّفراوانی و میوانداری مەدینە لە هیجرەتدا كەوتوونە ڕێ.

نێردراوەکەی خوای گەورە لەژیانیدا گەورەترین ناڕەحەت و زوڵمی پێگەیشت بوو... بەڵام ئەو باوەڕێکی وای هەبوو کە هیچ ڕێگریەکی کافرەکان ئەویان نەدەوەستاند.

ئەو بە هەموو عەقڵ و مەنتیق و زیرەکی سیاسی خۆیەوە سەرکەوت.. لەکۆتاییدا ئەو گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێنا. چونکە ئەو سەرکەوتنی گەورەی رزگارکردنی شارو وڵات و ناوچەکان نەبوو، بەڵکو بە چوونە ناو دڵ و ویژدان و هەستەکانی خەڵکەوە ئەوانی ڕزگار کرد.

ئەو دوو هاوڕێیەی لەڕێگەیەك و بەبێ هاسەر بەرەو مەدینە ڕۆیشتن، ئێمە ئەو ڕێگەیەمان بە هەشت کاتژمێر بە پاس بڕی. لەهەر گردو بەردو خۆڵ و هەر کاروانێکدا بۆ جێگەی پێی ئەوان دەگەڕام بە خەیاڵ.. ئێمە لەسەر کورسی نەرم و شوێنی خۆشی ناو پاسەکەدا ئەو ڕێگەیەمان بڕی، ئەوانیش لەسەر ئەو بیابان و زەوییە سووتێنەرە بە ئازارو ناڕەحەتیەوە بڕییان..

بەڵێ، ئێمە دەچووین بۆلای خۆشەویسترینی دونیا، نێردراوی هەموو مرۆڤایەتی، سەروەری هەموو موسوڵمانان، بۆ میوانداری ئەو و هانا بردن بۆلای... ئایا ئێمەی قبووڵ دەکرد؟! ئەم گوناهبارەی ئوممەتەکەی کە لە مەککە قبووڵ نەکرا، لە مەدینە دەڵێ "وەرە"؟!

بە دروست کردنی خەیاڵ و سووتانی ئاگری ئومێدو هاوارو فرمێسك ڕشتنەوە بەرەو شاری بەختەوەری سەروەرمان، ئەو مەملەکەتەی ئەوی تیایە. دەڕۆیشتین...

نوێژی نیوەڕۆمان دەگەیشتینە لای پێغەمبەرو لەوێ دەمان کرد "یا رسول الله ئێمە هاتین، شەرەفمەندمان کە بەو شەفاعەتەی کە بۆ ئوممەتەکەتی دەکەیت". بەم جۆرە دەپاڕاینەوە.

ئەمە تەنانەت بیرکردنەوەش لێی، خەیاڵ کردنیشی، ویستن و نیازکردنیشی کار لەسەر دەروونی مرۆڤ دەکات و هەستێکی سەیر دروست دەکات.

گەیشتینە ئوتێلەکەمان و بەخێرایی دەست نوێژمان گرت و لەگەل هاوسەفەرەکەم ڕامان کرد بەرەو (مزگەوتی پێغەمبەر).

## ماڵی پێغەمبەر:

یەکەمین مزگەوت و ماڵ و گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەری خوا هەر لەوێ بوو. چۆن ئەو ڕێگەیەی بەردەممان دەبڕی و بەناو خەڵکەکانی دەوروبەرماندا دەڕۆیشتین نازانم باسی بکەم...!

خودایە ئەوە چ گەرم و گوڕی و خرۆشانێك بوو. چۆن هەست و ڕەشەبایەکی هەڵکردووی ناخ بوو! وەك ئەوەی کەسێك لە پێشمانەوەیەو ڕادەکەین بەرەوڕووی.

کە یەکەمین هەنگاوم نایە ناو (مزگەوتی پێغەمبەر)، ئەو هەست و جۆشەی هەستم پێکرد لە نینۆکەکانی پێمەوە هەتا هەموو گەردیلەکانی گیانمی هەستاندە سەرپێ. بۆئەوەی نەکەوم بە زەویدا دەستم بە هاوەڵەکەمەوە گرت کە ئەو عاشقی ئیمان و پێغەمبەرە، فرمێسکی چاوەکانی بارانێکی دروست کردبوو.

ئەو هەوایەی کە دەچووە سیەکانمەوە منی هەڵدەفڕاندە دنیایەکی زۆر جیاوازترەوە، کە تێرم لێنەدەخوارد.

هاوڕێکەم بە دەستی ئاماژەی بەرەو لایەك کرد:

- سەروەری مرۆڤایەتی لەوێدایە. ئەوێ یەکەمین مزگەوت و یەکەمین خانەی سەعادەتە.

دوای نوێژ دەچینە خزمەتی..

خودایە! ئەوە چ خۆشیەك بوو! واتە ئێمە هاتووینەتە لای پێغەمبەر! ئێمە میوانی ئەوین، وایە؟! ئەو قبووڵمان دەکات؟!

ئەمەو هەزاران پرسیاری ترم لەخۆم دەکرد، بەڵام بەجۆرێك وەڵامەکانم دەست نەدەکەوت...

پێنج خولەکی مابوو بۆ نوێژ. خەڵکی کە چاوەکانیان شێداربوو، موسوڵمانە دڵ پڕەکان، عاشقە پەرۆشەکانی خوا دانە دانە دەهاتن و جێگەیەکیان دەگرت.

خەیاڵی منیش بەردەوام لەلای پێغەمبەر بوو.. لەناکاو لەگەڵ پێغەمبەردا ڕووداوێکی سەرنج ڕاکێشم بەبیرهات:

له كۆتایی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا یەکێك لە زانایانی ئەو کاتە کە (جەمال ئێوت ئالاسۆنیایی) دەچێت بۆ حەج لەگەڵ نارەحەتیە زۆرەکانی ئەو کاتەی ڕۆیشتن بۆ حەج. بەڵام ئەو بەبێ گوێدانە ڕێگرەکان، تێی دەپەڕێنێت و دەگاتە ماڵی خوا. چونکە بانگهێشت لەلایەن پێغەمبەرەوە هاتووە.

ساڵی( ١٩٢٨ )ە . ماوەی سیانزە ساڵ تێپەڕیوە بەسەر سەرکەوتنی چەنە کاڵێ دا .

مامۆستا لە مەدینەی منەوەرە ، لەگەڵ زۆرێك کەسی باشدا فرسەتی گفتوگۆو ناسینی دەست دەکەوێت. ئیتر یەکێکیش لەو زاتانە ئەو عوسمانیەیە کە خادم (خزمەتگوزاری) ی مزگەوتی پێغەمبەر بوو.

ئەو عوسمانییەکە کە دراوسێیەتی پێغەمبەری لە هەموو هەبوونی دنیا پێ باشترە. ئەو ڕیش سپیەکی هەق دۆستە.

دۆستایەتی عوسمانی ئیتر تووشی حەسرەت بووەو تێکەڵ بە فرمێسکەکانی بووە. (دەوڵەتی ئالیە) جگە لەوە شتێکی تر نالێت..

"ئاە لەو سەردەمە کۆنە" کە ئەمەی دەوت تا ئێستا شەش ساڵ دەبوو.. ئەو کاتە ئەم عوسمانییە لە مەککەو مەدینە حاکم نەبووە بەڵکو بە خادم (خزمەتگوزار) شەرەفمەند بووە.

سەرەڕای ئەو ڕاستیە، هەڵس و کەوتی ئەو زاتە کە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرە دەچێتە دڵی مامۆستاوە، کەمێك سەری دەسوڕمێ لەبەرئەوەی ئەو خۆشەویستی و گرنگییەی لە کەسێکی ترەوە نەدیوە..

ناتوانێت خۆشی لە پرسیارکردن بگرێت:

- بۆچی ئەوەندە خۆشەویستی عوسمانی؟ بۆچی خۆشەویستی خواو پێغەمبەر پێویستی خۆشەویستی عوسمانی دەهێنێتە پێش؟! ئەم پیرە نورانی بووبوو. بێ هیچ وەستانێك ئەم وەڵامەی دایەوە:

- بۆ خۆشەویستی عوسمانی بەناوی ئیسلامەوە یەك یادگاریم کە بەسەو زیاد دەکات..!

بەزۆری مامۆستا ئەو یادگاریە ڕاستەقینەیەو تاقانەیە باس دەکات:

-لە حەجی ساڵی ١٩١٥ ، لەناو زانایانی هندستاندا زاتێکیش هاتبوو. ئەو زاتە هەم زانا بوو، هەم لە دنیای دەروونی خۆشیدا دۆستێکی دەوڵەمەندی خوابوو، بۆ حەج سەرەتا هاتبووە سەردانی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە. یەکتریمان ناسی و گفتوگۆیەکی دوورودرێژمان کرد. بەڵام بەجۆرێك فرمێسکی چاوی و خەمی ناو دڵی لانەدەچوو.

لەبەرئەوەی ئەو چەند ڕۆژە ئەو خەمەی تەواو نەدەبوو پرسیم:

– ئێرە باخی بەهەشتە، مزگەوتی پێغەمبەرە، شوێن و جێگەی ئـەوە... بۆچـی ئـەم سـەردانە دڵخۆشـت ناكـات؟ یـان ئـەو فرمێسكانەی چاوت لە خۆشحاڵیدایە؟!

ئەو زاتە پیرۆزە كە فرمێسكەكانی زیادی دەكرد ئـەم وەڵامـەی دایەوە:

– خۆزگە فرمێسكەكانم خۆشحاڵیەكانی دڵمی دەربخستایە..! بەداخەوە بەو جۆرە نیە.. ئەمـە دوای چـەند سـاڵ بەنسیب بـوو، هاتمە زیارەتی ئەو جوانی جوانانە... لەنزیكیەوە ئەو حەسـرەتەم دەچەشت.. بەڵام چاودێریم دەكرد، لە ئاستی پێغەمبەردا نەبوو..

تـۆ بڵێـی چـاودێریم ڕاسـت بووبـێ؟! ئەگـەر وابێـت بۆچـی پێغەمبەرﷺ لێرە نیە؟ یان چاوی دڵم كوێر بووە؟! بۆچی هەست بەبوونی پێغەمبەرﷺ ناكەم؟ كام پلەو كام گوناهم ڕێگە لە بـوونی من دەگرێت بەرئەوە پەرێشـانی ئـەم بیركردنەوانـەمم لـەو كاتـەوە هاتومەتە مەدینەی منەوەرە.

پیری خادم لەدوای دەربڕینی ئەو قسانەی ئیتر نەیدەزانی چـی بڵێت.. بەڵام ئەویش مێشكی ئاڵۆز بووبوو. چـونكە لـەو هەسـت و بیركردنەوانەی ئەو زاتەدا نزیكی و خۆشەویسـتی بـەڕوونی دیـارە. هاتن لەو ڕێگە دوورەوە بۆ پەیوەندی لەگەڵ ئەو جـوانی جوانانـە، هـەڵگری ئـەو ڕۆحانیـەت و مەعنەویاتـە، بـەڵام هەسـت نـەكردن و نەبینین و نەبیستنی، بۆچی بوو؟!

ئـەو شـەوە پـیرە خادمەکـە بـەو بیرۆکـە سـەیرانەیەوە لـە جێگەکەیدا پـاڵ دەکـەوێت، لـە خـەونی نزیکـی نوێـژی بەیانیدا، جوانی جوانـان دەبینێـت. بێگومـان زۆر دڵخۆش دەبێـت، سـەری دەسوڕمێ، وتەکانی زانا هندیەکـەی بەبیردێتـەوە. لـەو بابەتـەوە پرسیار کردن بەبێ ئەدەبی دەزانێت لەبەرئەوە ناپرسێت.. بـەڵام پێغەمبەری خواﷺ ئەو بە پەرۆشی جێناهێڵێت پێی دەفەرموێت:

– بەڵێ، ئەوەی هەستی پێدەکەیت ڕاستە من لە مەدینە نیم لە چەنە کـاڵێم.. دڵـم ڕازی نـەبوو ئـەو نـەوە سـەربازانەم نارەحـەت بەجێ بهێڵم. ئێستا یارمەتی ئەوان دەدەم.

ئەم گرنگی پێدانەی جوانی جوانـان (پێغەمبـەرمانﷺ) لەگـەڵ ئوممەتەکەیـدا زۆر کـار لـە مامۆسـتا دەکـات، بـەقووڵی دەیخاتـە بیرکردنەوەو دەیگریەنێت.

بەم جۆرە پێغەمبەرمانﷺ لـە لوتکـەی میهرەبـانی و سـۆزدایە کـە ئـاوا بـۆ یارمەتیـدانی ئێمـە ڕادەکـات و دەلـەرزێت و جێمـان ناهێڵێت... خوا هەمورمان لە شەفاعەتیدا کۆبکاتەوە... ئامین..

(چەنە کاڵێ)، داستانێکە:

کاك ئەحمەد بەسەرهاتێکی ئەوەندە جـوانی بـۆ گێڕاینـەوە کـە هەموومانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو، چونکە ئێمـەیش نـەوەی چەنەکاڵێ بووین.

## پاڕانەوە:

لەناخی خۆمدا لە هاوارو نالـەی خـۆم دەمـوت "سـەروەرمان، دەی ئێمەش نەوەی ئوممەتەکەتین لەو شێرانەی چەنە کالّێ، کـە زۆرت خـۆش دەویـن. چـی دەبێـت لەبـەر خـاتری ئـەو ئیمـان و پەرۆشـی و قارەمانیـەی ئـەوان ئێمـەش وەرگـرەو شـەفاعەتمان بۆبکە. دەستی ئێمەش بگرە. بۆ ئێمەش لای خوا ببە بە تکاکار.

یـا رسـول الله! لـە خۆشەویسـتی و میهرەبـانی تـۆ ئـەم گەردوونـەش دروسـت کـراوە چـی دەبێـت دەرگـا لـە ئێمـەش بکـەرەوە. ئێمـەش بخـەرە ژێـر بـاڵی خـۆت. ئێمـەش بخـە ڕیـزی ئەوانەی ڕزگاریان دەکەیت.

ئەم نوێژە زۆر نوێژێکی جیاواز بوو. لەکاتی نوێژەکەشدا نالـەی هەستەکانتم دانەدەمرکایەوە.. هێـز نـەمابوو لـە ئەژنۆکانمـدا بـۆم ڕاگـیر نـەدەکران. دوای کـەمێکی تـر دیـدارو خوانێك دەسـتی پـێ دەکرد نازانم دەمتوانی بەرگە بگرم؟ نازانم لەو ساتەی کە دڵـەکان ئاگر تێ بەردەدات دەتوانم دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا هەبێت؟

نوێژ تەواو بوو... موسوڵمانە بەجۆشـەکان بـە تەکبیرکردنـەوە بەرەو لای پێغەمبەر چوون.. ئەمە ڕۆیشـتن نـەبوو.. ئەمـە سـاتێك بوو کە پێکان لە زەوی هەڵدەگرێت، ژێـری لەسـەردا نامێڵێـت، دڵ لەجێی خۆی ڕادەچڵەکێنێت.. ئەمـە ڕۆیشـتن نـەبوو، بـۆ هەنـدێك

ڕاکردنێك بوو، باڵ گرتنێك بوو.. بۆ هەندێکیش وردە وردە هەنگاو نان بوو بەرەو لای خۆشەویستی خۆشەویستەکان.

هەر هەنگاوێك.. هەر نزیك بوونەوەیەك.. هەر جووڵانەوەیەك بەرەو لای پێغەمبەر نزیکی دەخستینەوە.. لەهەر نزیك بوونەوەیەکیشدا جۆش و خرۆشێکی سەرسوڕهێنەر مرۆڤی دادەگرت.

ئەوەی کاك ئەحمەد باسی دەکرد تەنها خۆی هەستی پێ نەدەکرد. بێ گومان.. ئەی ئێمە؟!

لەگەڵ گێڕانەوەکانی ئەودا ئێمە لەجێی خۆمان زیاتر دەتواینەوە.. لێدانەکانی دڵمان خەریك بوو لەناو قەفەسەی سنگماندا بێ وەستان بەرگەی نەدەگرت.

وەك ئەوەی ئەو کاتە. ئەو ساتانە لەگەڵ هەموو هەست و گەرم و گوڕیەکانی پێکەوە هەستمان پێ دەکرد.

ڕۆیشتنیش مانای چی بوو؟ دەسووتاین، زیاتر پەرۆش دەبووین لەهەر چرکەیەکدا..

دەی ئەمە ئەو کاتە بوو کە ساڵانێکە خەونەکانم دەڕازێنێتەوە، دەچێتە خەیاڵەکانمەوە، ئەو ساتەی دەمانخاتە گەردەلوولی جۆش دانەوە... ئەو کاتە کاتێکە بێ وەسف کردنە کە زمان تیایدا دەوەستێت.. کاتێکە وشەکان لەبەرامبەری بچووکن.. چۆن باس دەکرێت؟ چۆن وەسف دەکرێت؟ هەتا ئێستا هیچ کەس

نەیتوانیوە باسێکی بکات شیاوی خۆی بێت.. بەتەنها جۆش و خرۆشی هەستەکانی و فرمێسکی نەوەستاوی چاوەکانی و لێدانی توندی دڵی دەتوانن باسی بکەن.. بێ دەنگ و بێ سەدا..

## ئەو ساتە باس ناکرێت:

بەیارمەتیتان.. بمبەخشن تکایە.. ئەو ساتە منیش ناتوانم باسی بکەم.. گەیشتنم بە پێغەمبەر.. لەئامێز گرتنی خۆشەویستی خۆشەویستەکان، تێکەڵ بوون بەو ژینگە وەسف نەکراوەی ئەو، چۆن دەتوانم باسی بکەم؟!..

بمبورن.. ئەو ساتەوەختە ناگێڕدرێتەوە.. ئەو ساتە تەنها دەبێت تیایدا بژیت.. إن شاء الله ئێوەش کە تیایدا دەژین لە مەبەستم تێدەگەن. هەزاران جار سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانیان کە هەلی دۆزینەوەی ئەوەی دامێ کە بۆی دەگەڕام، دۆزیمەوە ئەوەی لەدووی وێڵ بووم.. سوپاس بۆ خوا.

ئەو هەست و جوانی و حەزو چێژەی کە من لە دوور بۆی دەگەڕام لەناو خۆمدا دۆزیمەوە.. مەگەر خوای گەورە چ جوانیەکی لەناو ئەوێدا دروست کردووە! مەگەر دڵ جگە لەوێ ئاراستەیەکی ترو عەشق شێوەیەکی تری هەیە جگە لەوێ..!

ئەگەر مرۆڤ بە سەرنجەوە تەماشای دەوروبەری بکات، ورد بێتەوە لە نهێنی و حیکمەتی جیهان بەدڵنیاییەوە ئەوەی بۆی دەگەڕێ دەیدۆزێتەوە.. ئەوەندە بەسە لەو جوانی جوانانە داوا

بکـات. ئـەو بـێ دوودڵـی دەرگـای داواکـاری دەکاتـەوە. ئەگـەر نەیکاتەوە ئێمە نازانین داوای بکەین یان بە هەڵە داوای دەکەین.

کاک ئەحمەد بەدەم هەنسکەوە لە قسەکانی بووەوە.. ئێمـەش وەکو ئەوەی لەو جێگە پیرۆزانەدا بین بەوردی و بە قووڵی گوێمان لێ ڕاگرتبـوو. چ گوێگرتنێـك! وەك نـاو دەمـان خـواردەوە، وەکـو هەوا هەڵمان دەمژی لەگەڵ ئەوەی ئێمە چەند ڕۆژە لە حەسـرەتی خۆشەویستی ئەو دیدارەداین، کاك ئەحمـەدیش بـە گێڕانـەوەکانی ئەوەنـدەی تـر ئێمـەی دەسـووتاند و لـەحاڵێکی بەرگەنـەگرتوو بووین.

ئـیتر لای ئێمـە هـەموو کاتـەکان وەسـتاون، هـەموو شـتێك بـێ دەنگـە، تـەنها ئـەوێ هەیـە.. ئـەو جێگـە پـڕ جـوانی و نهێنـی و ئەندێشانە.. لەسـەروو هـەموو شتێکیشـەوە گـەورەی گـەورەکان، خۆشەویستی خۆشەویستەکان پێغەمبەری لێیە.. ئێمە بۆ گەیشتن بە بۆنخۆشترینی گوڵەکان، بۆ ڕاکردن بەرەو لای ئەو لەناو تـونێلی زەمەندا لە خوا دەپاڕاینەوەو بۆ زووتر گەیشتن..

گێڕانـەوەکانی کـاك ئەحمـەد هـەموومانی هەسـتیار کردبـوو، هەموومانی هەڵفڕاندبوو بەرەو دنیای گوڵـەکان، بـەڵام هـیچ کـەس وەکـو سـەیدا کاریگـەر نـەبوو پێـی.. هەنسـك و فرمێسـکە نەوەستاوەکانی، (ألله أکبر)ە بەردەوامەکانی ، هەسـت و سـووتان و خۆشەویستی و پەرۆشی گەیشتنی نـاخی ئـەوی نیشـان دەدا..

ئەو تەواو مرۆڤێکی جیاوازبوو وەك ئەوەی ئەو لەم دنیایەی ئێمە نەبوو، تەنها جەستەی لێرە بوو، ڕۆحی دەمێکە فڕیوەو گەیشتووەتە ئەو جیهانە ئەفسووناویە.. ئەو لەناو حەزی مەعنەوی هەمیشەییدا توابوویەوە.. ڕەنگە ئەم هەستی مۆگرییەی من بەوەوە لەبەر ئەو جوانیەی ناخی و ئەو پێگەیشتنە تەواوەی بوو بێت..

کاتێـك فڕۆکەکـە لـە نزیـك فڕۆکەخانـەی جـددەوە خـەیك بـوو دەنیشتەوە ئیتر هەست و نەست و جۆش و خرۆشیی و پەرۆشـی من گەیشتە پلەیەك کە هیچ کات تیایدا نـەژیاوم.. بـە سـەیرکردنی یەکتر تێدەگەیشتین ئەمە فشارێکە لەسەرمان..

لـەناو دەسـتمان جەوشـەن، لەسـەر زمانمـان تـەکبیرو لـە دڵەکانماندا گـەرم و گـوڕی و خرۆشـان، لەناخیشـماندا حـەزی زوو گەیشـتن .. وەرەو بەرگـەی ئـەو جـوانی و لەرزینـە سـەیرەو ئـەو هەوایەی ئەوێ بگرە...

"خودایـە چـی دەبێـت حـەزەکانمان بـێ دیـدار مەهێڵـەرەوە ! خەیاڵەکانمان مەبڕە، چی دەبێـت ئـەم بەنـدە گوناهبارەشت لـەو کـەش و هــەوا مەعنەویەیـدا بتوێنـەرەوە. ! منـیش بگەیەنـەرە پێغەمبـەری تـاجی سـەرو دەوای دەردی دڵـەکان و سـەروەری گوڵـەکان. ! لـە ئـامێزی ئـەو بـێ بەشـم مەکـە". لەگـەڵ دانـانی یەکـەمین هـەنگاومان لـە فڕۆکەخانـەی ئـەو شـوێنە پـیرۆزە وەك ئـەوەی چـووبێتمە نـاو هێزێکـی کـێش کردنـی سـەیرەوە، هـەموو گەردیلەکانی گیانم دەلەرزین، هەستم بە حەپەسان دەکرد.

وەك مەحشەر بوو ئەو دەوروبەرە، مرۆڤەکان بێگەردو تەوبەکار لەناو ئیحرامـی سپی دا، چـاوەکانیان شـێدار، دڵـەکانیان ورووژاو و زمانیان لە تەوبەکردنی خوادا بوو بۆ تەمەنێك ئەنجام دانـی گونـاه و داوای شەفاعەتیان لە پێغەمبەر دەکرد.

دابەزین لە فڕۆکەکەو یەکەمین هەنگاوەکانم لەسەر ئەو خاکە پیرۆزانە دەبێ چۆن باس بکەم خودایە؟!

لەگەڵ ئەوەش لەژێر ڕەشەبای جۆش و خرۆشانەکانی گیانمدا لەسەر پێم خۆم بۆ ڕانەدەگیرا. لەکاتی یەکەمین هەنگاوم کە لەسەر ئەو زەویە پیرۆزە دەمنا، هەستم بە هەموو گەردەکانی لەشم دەکرد توشی سەرسوڕمان بوون، خۆم دۆزیەوە کە خەریك بوو دەکەوتمە ناو بیرێکی قووڵی بێ بن.

خودایە ئەوە چ لەرزینێك بوو، چ داچڵەکینێك بوو، ئەوە چ هەستێکی نەرم و بەرگە نەگیراو بوو! دەنگی تەکبیرکردنی ئەوانەی دەوروبەرم وەکو بایەکی سارد منی هەڵگرتبوو بەرەو دنیای تر دەیبردم.

لە پێش و لەدوا و لای ڕاست و چەپمەوە ئەو ئیحرام سپیانەی دەوروبەرم وەکو ئەوەبوو خۆیان بۆ مردن ئامادەکردبێت، هەستێکی مەحشەریانەیان بە مرۆڤ دەدا.. هەستم بە خۆم کرد کە هەنگاو هەنگاو بەرەو ئەو دادگای مەحشەرە دەڕۆیشتم، لەو دەنگانەدا دەنگی سەیدا هاتە گوێم دەیوت:

"یارمەتیم بدە خوایە، وەرە بە هانام.. من بە گوناهی هەڵنەگیراو و هەڵەو تاوانی قبووڵ نەکراوەوە بۆ لای تۆ دێم"

ئەگەر بەندەیەکی پاکی خودا کە ژیانی هەمووی لە خزمەتی خواو

ئیمان و قورئاندا بەسەر بردووە بەو جۆرە خۆی بچووك بكاتەوەو لەخوا بپاڕێتەوە. بەم جۆرە بگری و فرمێسك بڕێژێت..

ئەی من؟! ئەی تاوانە گەورەكانی من؟!

ئەی گوناهە تەواو نەبوو و نەبڕاوەكانی من؟! ئەی حەرام و سەرپێچیەكانی من؟

خۆم گەیاندە ئەو شوێنانەو بە ئاگری سووتێنەری ناخمەوە كەوتمە پاڕانەوەم.. لەبەردەم ئەوا كەوتم و سەرم دانا.. ئەوە داوای لێخۆشبوون كردنێك بوو كە زیاتر هێزی ئاگرەكەی ناخمی زیاد دەكردو خۆم ڕانەگرت و، لەهۆش خۆم چووم. خۆزگە هەرگیز نەدەهاتمەوە هۆش خۆم، خۆزگە لەو جیهانە ئەفسووناوی و پڕ لە نهێنی و جوانیە نەدەگەڕامەوە. خۆزگە ئیتر نەدەكەوتمەوە ژێر باری ئەو گوناهە هەڵنەگیراوانە..

## لەهۆش خۆم چووم

خەریك بوو لەهۆش خۆم دەچووم، ئەو دیمەنەی ژیانم دیاربوو. بۆ یەكەمین جار لەگەڵ دایكم و باوكم بە ڕوونی و دیاری یەكمان لەباوەش گرت بەجۆرێك خۆشەویستی و میهرەبانی و بۆنی میسكی ئەوانم هەڵمژیە ناخمەوە...

دایكم وەكو فریشتەكانی لێهاتبوو.. ئەو جل و بەرگەی و ڕووە درەوشاوەیەی چۆن باس دەكرێت نازانم..! بەیەك شەو، وەكو هەرە جوانی دنیا دەدرەوشایەوە، نوورو تیشكی دەدا بە

دەورووبەری.. ئەی باوکم؟ خودایە مرۆڤێك بەو جۆرە بێ وەسف و سیما شیرین دەردەکەوێت؟! ئەوەندە جوانی لە لێوەکانی و ڕووخساری دەدرەوشێتەوە؟!

لەو ساتەدا لەنێوان ئەو دوو مرۆڤە فریشتەیەدا گەیشتبوومە دنیایەکی تر.

بە دەنگێك کە هەموو بێزاری و خەمەکانی ناخمی دەسڕیەوە دایکم وتی:

– کچم.. ئێمەچاوەڕێی ئەو ڕێگایەی تۆبووین. ئەگەر بزانیت کاتێك مژدەکەمان بیست چەند خۆشحاڵ بووین.

وەڵامم نەدایەوە، چونکە لەهۆش خۆم چووبووم. لەناو کلێپەی دەروونی خۆمدا وەکو خۆڵەمێشم لێهاتبوو، کە خۆمم دەخواردەوە لەناوەوە بەتەنها ئەو هەوا سیحراویی و فراوانە بەقووڵایی ناخمدا دەڕۆیشت. لەو زەردەخەنانەی دایکم و باوکم کە دەروونی ڕووناك دەکردەوە تاسابووم.

باوکم وتی:

– ڕۆڵەکەم، لەبەر تۆ چەند پاڕاینەوە، لە چەند دەرگای ڕەحمەتماندا لەم کاتەدا کە بیستم گەڕاویتەوە، زۆر خۆشحاڵ بووم.. خوا لەسەر ئەم ڕێگەیەت لانەبات..کچم. دایکیشم توند بەرەو لای خۆی ڕایکێشام و وەکو منداڵێك گرتمیە ئامێز. لەیەکتر جیانەدەبووینەوە، هەر یەکترمان ماچ دەکرد.

– کچم مەترسە. هەموو کات لە لاتین. ئەو چەند مانگەی کە شەوانە لەسەر بەرماڵەکەت فرمێسکت دەڕشت و سەرت بۆ خوا دادەناو دەپاڕایتەوە ئێمە لەلات بووین و (آمین)مان بۆ دوعاکانت دەکرد.

وەکو بڵێی بە خۆمدا هاتمەوە:

– واتە ئەوکاتەی هەستم بە بۆنی ئێوە دەکرد، ئێوە لەوێ بوون.

باوکم وتی: بەڵێ، ئێمە ئەو کاتانە لەوێ بووین.

– ئێستا لەکوێن؟ ئێرە کوێیە؟

بەو نیگا شیرینانەی کە هەستەکانی فێنک دەکردەوە دایکم وەڵامی دایەوە:

–کچم، هەزاران جار سوپاس بۆ خوا کە پلەی شەهیدی بە منیش و باوکیشت بەخشی. تاقیکردنەوەی دنیا بۆ هەردووکمان زۆر سەخت بوو، بەڵام بەخششەکەی ئەوەندە گەورە بوو، کە پلەی شەهیدی پێ لوتف کردین.

ئێمە لەبەرئەوەی شەهید بووین، ئازاری مردنمان نەچەشت. خوا دوا هەناسەمانی لە کاتی بەخشین بە ئیزرائیل نەیهێشت ئازاری مەرگ هەست پێ بکەین. وەکو خەونێك جیهانی دنیامانی گۆڕی و هاتینە دنیای ئاسوودەییەوە..

شەهیدەکان لێرە سەربەستن. ئەو شوێنەی دەیانەوێت و ئەو کەسانەی دەیانەوێت دەتوانن بچنە لای. ببنە یارمەتیدەری ئەو بەندانەی کە لە باری خراپ و ناڕەحەتدان. لەبەرئەوە ئێمە هیچ لەتۆ جیا نەبووینەوە کچم.. ئیتر وەك دەیبینیت لەو کاتەوەی پێت نایە سەر ئەم خاکە پیرۆزە ڕووبەڕوو بووینەوە.. لەمەودواش لەگەڵت دەبین...

هەزاران جار شکور بۆ ئەم ڕۆژانەی خودا. کە لەدنیادا بووین ئازارو ناڕەحەتی و دەردی زۆر وای لێکردین دەمان وت " بەسە ئیتر بەرگە ناگرین"... چەندە نەزان بووین.. لەگەڵ ئەوەی کە ئەوانە دەبنە هۆکاری لێخۆش بوونی گوناهەکان..

واتە هەندێك کات خوای گەورە ئازارو ناڕەحەتی بۆ بەندەکانی دەنێرێت ئارامگری و خۆبەدەستەوەدانی ئەوانی پێ دەپێوێت..

لەکۆتاییدا دەبێتە هۆکاری لابەری گوناهەکانی ئەوان.

کچم ئەوە بزانە ئەوانەی کە لە دنیادا مافی خەڵکیان نەخواردبێت.. بەندایەتیەکانیان بەباشی کردبێت ڕزگاریان دەبێت.. إن شاء ألله تۆش ڕزگارت دەبێت.

لەناکاو دەروونم زەنگی لێدا بەئاگا هاتم. "من ڕزگار بووم" چیم نەدەدا بۆ ئەوە؟!.. بەڵام ئەمە چۆن دەبێت!

ڕابردووی پڕ لە گوناهی شەرمەزارکەر، تەمەنێکم هەیە کە ڕوو دەگۆڕێت... بەم ژیانە پڕ نەفرەتەوە چۆن ڕزگارم دەبێت؟! چۆن

خوا ئەو دیمەنانە دەسڕێتەوە؟ سەروەرمان چۆن یارمەتی یەکێکی ئاوا لە ئوممەتەکەی دەدات؟!

## دڵنەوایی دایکم:

دایکم وەکو ئەوەی هەست بە سووتان و هەستەکانی ناو ناخم بکات، وەڵامی ئەمانەشی دامەوە:

– خوا تۆی زۆر جوان دروست کردبوو. بەڵام ئەو جوانیەی بۆ خۆ بە گەورەگرتن و خۆفرۆشتن نا بەڵکو بۆ سوپاس گوزاری کردن پێ بەخشی بوویت. بەڵام جوانیەکەت لە تۆ کرایەوە، لەپیسی و گوناهدا بەهەدەر چوو.

لە ڕاستیدا ئەو جوانیەی کە تۆی وەکو شاجوان پێ هەڵدەبژێردرا، هەر ئەو جوانیە بوو بە بەڵا بەسەرتەوە. هەرواش بوو.ئەو کەسانەی دەوری خۆت کە لە دەمامکی دۆستدا دوژمنت بوون هەست پێ نەدەکردن. سەیدا چەند جار ئاگاداری کردیتەوە بەڵام پارەو ناوبانگ ڕاستیەکانیان لێ شاردیتەوە.

ئەی لە دواییدا؟! ئەوانەی مەبەستیان بوو ئابڕوت ببەن بردیان و تۆیان لە کەنارێك فڕێدا.

دواتر لەگەڵ دەردە مرێنەرەکانتدا بەتەنها مایتەوە. لە دەورتدا ئەو هەزارانەی کە وایان دەردەخست خۆشیان دەویستی پاشماوەیەکیان نەما.. هەنگاو هەنگاو بەرەو کۆتاییەك دەچوویت. لەگەڵ گەناه و سەرپێچیەکانتدا..

گەیشتیتە کۆتایی ڕێگەیەك بەبێ ئیمانی و بێ قورئان و بێ گەڕانەوە.. من و باوکت لەم نەهامەتیە قووڵەوە چیمان بۆ نەدەکردی، چۆن دوعامان دەکرد ئەگەر بزانیت..! ئەو هاوارو پاڕانەوەو لە دەرگا دانەمان...

خوای گەورە لە کۆتاییدا نووری هیدایەتی دەرخست، دەرگای ئومێدی کردەوە.. لەناو شان و شەوکەت و ژیانێکی بە ڕەونەق دا کە گرنگی و بەهای مەعنەویاتت لەبیر کردبوو، لەکاتێکدا بەو باشیە کەمەی لە دەروونتدا مابوو هاوکاری کچێکی بریندارت کرد.

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو کچە یەکێك لە بەندە باشەکانی و خۆشەویستەکانی خوا بوو کە شەهید بوو بوو.

ئیتر لەبەرئەو باشیەی لەگەڵ ئەو کچە شەهیدەی کردت، خوای گەورە ئەوی ناردە هاوکاریت. ئەو ڕۆژە جەژنی ئێمە بوو..

لەحالێکی سەیردا بەئاگا هاتم: هاوارم کرد:

– دایە تۆ ئەمانە دەزانیت؟!

– دەکرێت نەیزانین کچم؟! ئەو کچە شەهیدە بووە هۆی ڕزگاریت هاوڕێی ئێمەیە.. بە لوتفی خوای گەورە ئێمە ئەومان ناردە لای تۆ.چی دەبوو خوایە گیان چی دەبوو؟ لە پلان و حیکمەتەکانی تۆ چۆن ئەقڵ ناتوێنێتەوە؟! چۆن بگاتە مەنتقی مرۆڤەکان؟! ئەو دنیای کۆتاییەی کە دەڵێن زۆر دوورە، درێژە ڕێیە، چەندە نزیکەو لەبەردەممانە و لەناخماندا لە جێگەیەکدا

ڕاوەستاوە. ئاھ ئەگەر لەمە تێگەشتینایە، ئاھ ئەگەر ئەو ڕاستەقینانە بەتەواوی حاڵی بووینایە. چەندە جوان دەبوو!

بەڵام ئەم شەیتان و نەفسە.. ئەو مرۆڤە خراپانە، ئەو پێشنیارە زیان بەخشانە کە دەروونی پاکی مرۆڤەکان تێکدەدەن.

مانای ئەوەیە لەم سەردەمەدا گرنگترین و گەورەترین دەوڵەمەندی و جوانی، ئەوەیە کە دۆستی بەوەفاو دروستت لە دەوروبەرێکی باشدا هەبێت.. ئەمە گەورەترین دڵنیایی ژیانە..

ئەگەرنا مرۆڤ هەر ساتێك ڕەنگە لە کەندەلانێکدا هەڵخلیسکێت، یان هەڵخلیسکێنرێت..

دایکم وتی:

– سەیدا بۆ تۆ ڕزگارکەرێك بوو، بەڵام تۆ ڕاوت نا..

وتم:

– بەڵێ دەزانم چەندەم شت لەدەست خۆم دا.

ئەوە ئاگرێکی ناخمە کە دانامرکێتەوە... ئەقڵ و مەنتق گوێی بۆ ناگرێت. چاوی ئەو هیچ کەس نابینێت، بەڵام چاوی من جگە لە ئەو کەس نابینێت. خوا زۆر باش دەیزانی کە ئەوەی من دەمویست گۆشت و ئێسقانی ئەو نەبوو، بەڵکو خۆشەویستی و دنیای ڕۆحانی ئەو بوو.. خۆشەویستی ئەو لە خۆشەویستی مرۆڤ زۆر زیاتر تێپەڕی بوو. ئەو خۆشەویستیەکی هەبوو کە تەنها بە دیدار لەگەڵ پێغەمبەردا لێی تێر دەبێت.

سەیدا بۆ خۆشەویستی ڕاستەقینە دەگەڕا. ئەو پڕ بوو لە خۆشەویستی و عەشقی خواو پێغەمبەر. ئەو سازش بۆ هیچ خۆشەویستیەکی دنیایی ناهێنێتەوە هەرگیز. لەبەرئەوە دەرگای دڵت داخەو ئومێدت خامۆش کە.

- ئاه خۆزگە دەمتوانی!

- دەی کچم، چاوەڕێت دەکەن. ئێمە لەگەڵتین.

بەکۆتا حەسرەتەوە گەڕام بۆ دڵنەوایی و ئاسوودەییەك.

- دایە حاڵی من چی بەسەردێت؟ خوا لێم خۆش دەبێت؟ پێغەمبەر قبووڵم دەکات؟

دایکم ئەو نیگا شیرین و میهرەبانانەی کە دەروونیان دەبزواندم خستە سەر چاوەکانم. ئەوەندە پڕبوو لە خۆشەویستی و سۆز لەو کەشە فراوانەدا نە لە بەڵێی نە لە نەخێری تێنەگەشتم.

## خۆزگە نەدەهاتمەوە سەر خۆم

کە هاتمەوە هۆش خۆم، دیم ئۆزلەم خان و نورای خان هەوڵی بەئاگا هێنانەوەم دەدەن. کاك مەتین و سەیداش بە پەرۆشەوە چاودێرییان دەکردم.

ئاه لە من.. بۆچی بەئاگا هاتمەوە؟.. بۆچی؟ دەکرێت ئەو جوانیانە بەجێ بهێڵرێت؟ خۆزگە بۆ هەمیشە لەباوەشی میهرەبانی دایکم بمایامەتەوە.. بەردەوام بە هەست کردن بەو خۆشەویستیە درەوشاوەیەی باوکم لەلام بژیایە.

هەمیشــە خــەون و خەیاڵــەکانی مــن ئــاوا دەبێــت.. هەمیشــە حەسرەتەکانم لە بێ ئاگاییدا دەبینم و کە بەئاگا دێمەوە دەفڕن و دەڕۆن.

ئەوانەی بینیمن بۆ هاوڕێکانمم باس نەکرد.. نەمدەتوانی باسی بکەم. بەتایبەت لای سەیدا..

وتیان: "بەهەرحاڵ تاکەت دابەزی"

زۆر باش دەمزانی چی لە سەرم بەرز دەبێتەوەو چی نزم.

لەناو فرۆکەخانەکەدا ڕووبەڕووی هاوڕێیەکی سەیدا بووین. لـە کۆمپانیای گەشت و گوزاری کاری دەکرد. ئینگلیزی و عەرەبی زۆر باش دەزانی.وتی:

– ئێــوە بەتایبــەت دەبــەم. گوێزەرەوەیــەکی هــەوا گــۆڕکێی دروستم بۆ ئێوە ئامادە کـردووە. هـەتا مەککە مـن هاوڕێیـەتیتان دەکەم.

لەدوای نوێژەکانمان. سـوار ئوتومبێلـەکانمان بـووین. بـێ ئاگـا لەو شتە جوانانەی چاوەڕێیان دەکردین. وەکو یەکەمین گـروپ لـە بیابانەکەدا کەوتینەڕێ. ناو ئوتومبیلەکە پڕ بـوو لـە تـەکبیرو زکـر کـردن... حەسـرەتی دڵـەکان ئەوەنـدە بـەرزبوو کـە خـەریك بـوو لەهۆش خۆمان دەچووین. هـەر خولـەکێك هـەر چرکەیەك کـە لـە ئامانجەکە نزیك دەبووینەوە. هەموو دارو بەردو خۆڵێـك وەك بڵێـی هاوڕێیەتیمان دەکەن ئیتر ئەوکاتە نزیك دەبوویەوە.. ئـەو کاتـە..

کە گەورەترین شتی سەیر چاوەڕێی دەکردین.. لە ڕێگە لاماندا و نوێژی عیشامان کرد. پاشان کەوتینەوە ڕێ کات وەکو ئاو دەڕۆیشت، ئەو خرۆشانەی ئێمەی تاو دەدا لە قوڵایی دڵمانەوە جۆشی دەدایین بەرەو ڕووی ئەو شوێنە..

لە ناوەڕاستی ڕێگەکەدا کتوپڕ ڕۆیشتنەکەمان وەستا. ئوتومبێلی یەکەمین گروپ لە ناوەڕاستی بیابانەکەدا وتی "ناڕۆم" ڕابەرەکەمان هەموو هەوڵی خۆی دەدا.

ئێمە بە پەرۆشی ناخمانەوە کە کەمێك لەوەوپێش کەوتبووینە جوڵەو دەمانوت پاش کەمێك دەگەینە کەعبە..

سەیدا لە سووچێك مایەوە، لەدەستی دا جەوشەن و دیسان کەوتەوە خەیاڵی ناو ئەو جیهانانە.. ئەو پەرۆشیەکی تری نەبوو.. حەیرانی ئەو هەست و بیرکردنەوەو پشت بەستنانەی بوو..

هەمووان بیریان دەکردەوە "چی بکەین؟" بێ چارە مابوون، دەمانویست لەناوەڕاستی بیابان بمێنینەوە.. دەمانویست نوێژی بەیانی لەناو ملیۆنان هەستی بزواو و خەڵکی خۆشەویست لە کەعبە ئەنجام بدەین.

## ڕووداوی پڕ پەند:

لەو کاتەوەی ئومێدەکانمان بڕا، لە پشتەوە ڕێبوارێکی تر هات. هات و لە تەنیشتمان وەستا. ئوتومبێلەکەی زۆر گران بەهاو لە ئوتومبێلەکانی ئێمە باشتربوو..

زاتێکی تەمەن مام ناوەند، کەمێك ئەسمەرو نوورانی دابەزی، ڕوخساری لە عەرەب دەچوو، بەڵام نووری ڕووخساری تەواو جیاوازبوو. لەناو خەڵکدا دەڵێن "جوانی ناو کوڕان"! تەواو بەو جۆرە بوو ئەویش...

سەلامی کردو لەگەڵ ڕابەرەکەمان دوای تەوقە کردن بە عەرەبی کەوتنە گفتوگۆ.. یەکسەر دەرگای پێشەوەی ئوتومبێلەکەی کردەوەو بە دوو سێ خولەك خەریك بوون خستیەوە کار.

دوای چەندین کاتژمێر مانەوە بەبێئومێدی، وەك بڵێی موعجیزەیەك ڕوویدا.. بەخۆشحاڵیەوە چووینەوە ناو ئوتومبێل و کەوتینەوە ڕێ.. ڕابەرەکەشمان سەری سوڕماو مابوو بەو کەسەی ئوتومبێلەکەی خستینەوە کار.

وتی:

– پیاوێکی زۆر نامۆبوو، کە تەوقەی لەگەل کردم هەستم بە وزەیەك دەکرد هاتە گیانمەوە.. چ دەستێکی نەرم بوو خوایە .. مرۆڤێکی نوورانی و غەریب و نامۆ لەناوەڕاستی بیاباندا .. کۆتا قسەشی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو..

کاك مەتین وتی:

– چی وت؟!

– من چاودێریتان دەکەم یارمەتیتان دەدەم. إنشاألله دەگەنە نوێژی بەیانی لە کەعبە.

– الله أکبر..

هەمووان سەرسام بوون بەم قسەیەی.

– باشە چۆن دەزانێت ئێمە ئارەزوو دەکەین بگەینە نوێژی بەیانی؟

باشترین لێکدانەوە سەیدا کردی.

– لەبیرتان بێت.. لەسەر خاکە پیرۆزەکانین.. لێرە هەموو شتێك بە ئەقڵ و مەنتق ناپێورێت. لەم شوێنانە دڵ و هەست و حەسرەتەکان دەدوێن.. ئەم بیابانە جێیەکی بۆش و بێ ڕۆح نیە وەك ئەوەی زانراوە.. پڕە لە خۆشەویستی و عەشقی ملیۆنان ڕۆح و جەستەی کەسانی عاشقی خواو پێغەمبەر بۆ چەندین سەدە.. ئەو کەسە پیرۆزو شەهیدانە لێرە لە خۆڕا دەمێننەوە؟!

بەڵێ سەیدا ڕاستی دەوت.. هەموو شتێك ڕوون بوو. دیاربوو خوای گەورە بەندەیەکی خۆشەویستی خۆی ناردە هاوکاریمان. بەلام کێ بوو ئەو زاتە؟

ئەم پرسیارە ئۆزلەم خان کردی:

بێ دەنگی جوانترین وەلامی ئەو پرسیارە بوو.

بەو دڵە پڕ لە خرۆشان و پەرۆشیەمانەوە کە ئەم ڕووداوە سەیرەش ڕوویدا ئەوەندەی تر لە خەیاڵ و ئەفسونا ماینەوە..

ڕەنگە ئەمە زیاتر لە مێشکی مندا ئاوا بووبێت، لەڕێگە کە خەیاڵم دەکرد، ئەو زاتەم دی کە یارمەتی داین.. پێم وت:

– تۆ کێیت؟ زۆر حەزدەکەین بزانین کێیت..!!

سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و، گیانی دەوروبەری هەڵدەڕفاند.. لەتەنیشتی ئەوەندە بە بچووك مابووم، پەشیمان بووم لە پرسیارەکەم. وتی:

– سەیدا دەزانێت کێم.. ئاوڕی دایەوەو ڕۆیشت. بەڵام ئەوە ڕۆیشتنێك بوو کە بە هەر هەنگاوێکی هەموو شتێکی لە ئامێزدەگرت و بەقوڵەکانی هەموو بیابانەکەی دەشاردەوە.

## خەونێکی شاراوە:

کە بەخەبەر هاتم، خەون بوو.. خودایە ئێستا چۆن ئەمە باس بکەم؟ باسی بکەم گونجاو دەبێت؟! باسم نەکردایە لە مەراقدا دەمامەوە زۆر پەرۆش بووم، لەو کاتەدا دیسان ڕابەرەکەمان باسەکەی کردەوە، وتی:

– خودایە لەمێشکم دەرناچێ ئەو ڕووداوە.. لەم ڕێگایانە چەند ساڵە دێم و دەچم. ئەمە یەکەمین جارە توشی شتی ئاوا دەبم!

ئەو زاتە دیارە هاونیشتیمانیەکی ئاساییە.. ڕەنگە شەهیدێك بووبێ بەڵام کێیە؟. سەیدا بە نیگا کردنەکانی بۆ دەرەوە بە حەسرەتەوە ئەو وەڵامەی دایەوە کە چاوەڕێم دەکرد..

- بە شان و شەوكەت و هێزو تواناییدا حەزرەتی حەمزەم هاتەوە بیر. ئەو گەورەی شەهیدەكانە. دیارە كە ئەو وەك هاوڕێ و هاوكاری مەعنەوی ئێمە ئەو باوەڕەی پێ دراوە..

خودایە ئەمە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو.. چونكە ئەو زاتە ئاسایی و وەكو ئێمە دەركەوت. مانای ئەوەیە سەیدا ئەو خەونەی دیوە كە من بینیم. واتە سەیدا ڕۆحی لەگەڵ ئەو دنیا نەزانراو و نەبینراوەدا بوو كە ئێمە نەماندەزانی.

واتە لەگەڵماندا وەلی و بەندەیەكی خۆشەویستی خوا هەبوو كە تا پلەی حەزرەتی حەمزە دەڕۆیشت..! ئەم ڕووداوە پڕ ئەفسوونە دیاربوو كە لەبەر ڕێزی ئەوبوو.

خودایە ئەمە چ جوانیەكە؟ چ ڕەحمەت و دیاریەكە! چ بەخششێكی گەورەیە.. ئەم بەندەیەش لە ئێمە جیامەكەرەوە. ئێمە بەندەی باشت نین، بەڵام لەگەڵ خۆشەویستانت و خۆشەویستی ئەوان لەبەر ڕێزی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی ئەوان یارمەتی ئێمەش بدە.

لە کەعبە نزیك بووینەوە. ئیتر کێ دەتوانێ بخەوێ، بێدەنگ بێت، خۆڕاگربێت، بەئاگا بێت...! چاوەکانمان یادگاریەکانی پێغەمبەرو ئـەو هاوەڵانـەی دەبینـی کـە بـۆ ئێمـە و ئایینەکـەیان گیانیـان بەخشی.

دڵـەکان بـۆ یەکـەمین جـار دەسـووتان بـە ئـاگری ئـەو خۆشەویستیەی جیهانی هەڵدەفڕاند.

پێیـەکان یەکـەمین جـار بـوو دەچـوونە ئـەو شـوێنە پیرۆزانـە، هەستیان بەو ئیمانە جۆش دراوەی چەندین سەدە، ئەو دڵسۆزی و فیداکاریانە دەکرد.

جیاوازبوون ئەو جێیانە.. ئەم لم و بیابانە قسەیان دەکرد.

ئـەم دۆڵ و شـوان و سروشـتە چـەندین یادگـاری بـە بـیر مـرۆڤ دەهێنایەوە..

مەککە. کەعبە، صەفاو مەروە، شاخی حراء وە زۆر جێگەی تر بە جۆشی خاوەندارێتی پێغەمبەرەوە . دەدات لە هەستی ملیۆنان موسوڵمان، قارەمانیەتیەکانی ڕابردوو بەگوێی ئێمەدا دەچرپێنێ.

سەدان ساڵ تێدەپەڕێت و ئەو خورمـاو ئـاوی زمزمـە هەسـت و خرۆشـان و شـیفا بەمرۆڤایـەتی دەبەخشـێت و ئـەو چـێژە لەگـەڵ پێغەمبەر هەست پێدەکرێت. هەمان چێژ هەواڵی پڕ نهێنی بە ئێمە دەگەیەنێت.

## ئاه مەککە ! ئاه کەعبە !

چۆن بڵێم چۆن باسی بکەم نازانم! تەنها شتێك دەزانم، ئەوێ هەرگیز باس ناکرێت.. چونکە لەوێ زمانەکان بێ دەنگ و گوێیەکان نابیستن. تەنها هەست و دڵ و فرمێسك و ڕۆح قسە دەکەن. بەجۆرێکیش قسە دەکەن، زمانەکان ڕادەمێنن، لای ئەم قسانە شەرمەزار دەبن.

ناتوانم باسی بکەم.. یەکەمین هەنگاوی لەباوەش گرتنی کەعبەم، وەك ئەوەی لەگەڵ ملیۆنان کەسدا کە تەوافیان دەکرد ئەو هەستە دەیهەژاندم.. ئەو ساتە ناتوانم باس بکەم.. ئەو پاڕانەوەو داوای لێبوردنانەی کە بەرز دەبوونەوە.. ئەو لێدانە بەرزانەی دڵەکان کە تێکەڵ بووبوون. وەك ئەوەی بڵێسەی ئاگرێك هەبێت کە بۆنی گۆشتی دڵە سووتاوەکان بڵاو بکاتەوە..

ناتوانم باسی هەستی توانەوەی گوناهەکانتان بۆ بکەم.. لەنوێژی بەیانیماندا...

چۆن دەتوانم باسی بکەم.. دەستی کراوەو کڕنوش بردنی ئەو موسوڵمانانەی کە بە درێژایی تەمەنێك لە خۆشەویستی و عەشقی ئیلاهی و ئەو شوێنەدا ژیاون؟!

هەر وشەیەك کە بە لەرزینەوە باوەشی دەکرد بە هاناو پەنابردن و پاڕانەوەیەکی گەرم کە لە دەمیان دەهاتە دەر!

مەگەر ئێوارەو بەیانی ئەوێ تەواو جیاواز نەبوو..؟! مەگەر خەوی ئەوێ وەك بەئاگایی ئێرە نەبوو؟! مەگەر چاوەكان لەوێ جیاواز ناگرین؟! كسپەی هەستەكان و بێ ئارامی دڵەكان، وتراوی زمانەكان تەواو جیاوازبوون.

خوای جیهان فەرموویەتی: ﴿ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ﴾

واتە: "هەرشتێكی باش داوا بكەن، پێتانی دەبەخشم".

دەی شوێنی داواكردن ئەوێیە.. ئەمە ئەگەر بزانرێت، دڵ ناتوێتەوە؟ هەروەها بە دڵسۆزی و بێگەردی و پاكی داواكردنێكەوە كە...

## ژیانی پڕ پەندی خانمێكی پیر

چۆن لەبیر دەكەم. ئەو ژنە پیرەی كە خەڵكی ئەنادۆڵ بوو. لای كەعبە دەستمان گرتبوو..

دەستەكانی كردەوە، لەگەڵ فرمێسكە باراناویەكانی، بەو تەنها ڕستەیە كە دەیزانی دەپاڕایەوە لەخوا:

"خودایە من هەڵەبووم، بۆ داوای لێخۆشبوون هاتوم، بمبەخشە".

ئەمان خودایە! ئەمە ئەوەندە كاریگەربوو، ئەوەندە لە ناخەوە بوو كە ئەو دەپاڕایەوە ناخی من دەڕما، هەستی من دەهەژا.

"مـن هەڵـەبووم" ئـەو وتەیـەی خانمـە پیرەکـە، بـە چـەندین کاتـژمێر پاڕانـەوەی، ئەوەنـدە کـاری تێکردبـووم کـە بـە تەمـەنم پاڕانەوەی ئەوەندە لە ناخ و دڵەوەم نەدی بوو.

بەرگەم نەگرت دەستی ئەو خانمەم گرت. وتم:

– من بەقوربانت بم، چی دەبێت ڕاستیەکەم پێ بڵێی..!

وتم: – تۆ کێیت بۆ خاتری خوا! ئەمـە چ پاڕانەوەیەکـە، منـت لە ناخەوە هەژاند.

بـۆ چ گوناهێـك دەتـەوێ بپاڕێیتـەوە؟ دەبـێ چـۆن گوناهێـك بێت؟!

چی دەبێت، پێم بڵێ چی بووە!.. ئەو گوناهەی کردووتە، ئـەم پاڕانەوە بەکوڵەت نهێنیەکەی چی‌یە!

ئەو خانمە پیرو، سیما نوورانیـەی خـەڵکی ئـەنادۆڵ، چاوە پـڕ گریـان و فرمێسـکاویەکانی بڕیـە مـن. وەك ئـەوەی هەسـتی بـە پەرۆشیم کردبێت کەوتە قسە:

– قوربانت بم، کچی جوانم. من نەزانم، خوێندن و نوسین نازانم هاوسـەرەکەمم لـە سـی و پێـنج سـاڵیدا لەدەسـت دا. دوو منـاڵم پێگەیاند. سوپاس بۆ خوا دەستم لە حەرام نەداوە، لەم قورگـەوە یەك پاروی حەرام نەڕۆیشتۆتە خوار.

بەڵام دەردێکم هەیە، بۆ ئەوە هاتوومەتە ئێرە.

ئەو قسە پاك و جوانانەی ئەو پوورەم بڕی و بە ماچ کردنی دەستەکانی پرسیم:

– چی‌یە ئەو شتە؟!

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا. وەك ئەوەی حەسرەت و سەرسامی گوناهی بە ئەندازەی شاخەکان بێت . وتی:

– کچم، هاوسەرەکەم زۆر دیندار بوو. منیش بەو شتانەی ئەو دەیخوێند گوێم دەگرت، ڕۆحم پشووی دەدا، دڵم پڕدەبوو لە ئاسوودەیی، مێشکم هێواش دەبووەوە.

هەموو ڕۆژێك دوای نوێژی بەیانی و عیشا قورئان و جەوشەن و پەیامی نووری دەخوێندەوە. منیش لەبەرئەوەی خوێندنەوەم نەدەزانی گوێم بۆ ئەو دەگرت. کە گوێم دەگرت بەجۆرێك پشووم دەدا وەك ئەوەی سەدان دکتۆر چارەسەریان کردبم.

## ئەوەی لە خەون دیبووی:

ئەوەی کە لە هاوسەرەکەمەوە دەمبیست، هەستێکی لە مندا دروست دەکرد وەکو کچێکی گەنجی عاشق.

بە پەرۆشەوە پرسیم:

– هی کێ؟

– دەکرێت بڵێیت هی کێ؟ هی خواو پێغەمبەر.. هەموو ساتێکم لەگەڵ عەشقی ئەواندا دەڕۆیشت کە ناخمی داگیرکردبوو.

زۆر شەو لە خەونمدا پێغەمبەرو مامۆستا سەعیدی نورسی و حەزرەتی ئەبوبەکرم دەبینی.

هاوسەرەکەم لە تەمەنی گەنجیدا بە شێرپەنجەی گەدە گیانی سپارد کە مردیش وەسیەتی بۆ بەجێ هێشتم:

– چی وت؟!

– خانم، ئەگەر ڕۆژێك پێغەمبەرو ئەو زاتە گەورانە نەیەنە ناو خەونەکانت، ئەگەر ڕۆژێك ئەو خەونانەت بسڕێنەوە، بزانە کە هەڵەو کەم و کورپیەکت ئەنجام داوە. بۆ ئەو داوای پاڕانەوەو لێخۆش بوون بکە لای خوا.

کچم، تۆ زیاتر دەژیت. ئەگەر خۆشەویستی و عەشقی هەموو گورانی جیهان کۆ بکرێتەوە لە لایەك، ناگاتە ئەو خۆشەویستیەی بۆ تۆ هەمە. هەست و دڵێکی جوان نیە کە شیاوی دڵ و دەروونی تۆ بێت.

ڕۆیشت.. گەیشتە ئەو دۆستانەی زۆری خۆشی دەویستن و عاشقیان بوو؛ هیچ لە زمانی دانەدەبڕان.. ئەو ئێستا لەژێر ڕەحمەتی خواو لای پێغەمبەرمانە.. دیسان بە پەرۆشەوە پرسیم:

– چۆن دەزانیت پورێ؟

– قوربانت بم.. بەردەوام لە خەوندا دەبینم کە لای پێغەمبەرە.. مامۆستا سەعیدی نورسی چەندین جار موژدەی داومەتێ "هاوڕێم سەید لای خۆمە، ناوی منی هەڵگرتووە".

•

لە حەسرەتدا بووم: ئەم خانمەی خۆی بە هەڵەو نەزان دەزانێت باسی چی دەکات؟ بەرگەم نەگرت

– پورێ گیان. ئەمانە چ نیعمەتێکی گەورەن، چەندە ڕووداوی جوان و ئیرەیی پێ براون. کەسێك ئاوا بژی، دەردی چی هەیە؟

سەری داخست. دیسان فرمێسك چاوەکانی داگرت، بە لێوی لەرزیوەوە دەنگێکی سووتێنەرەوە تەنها ڕستەیەکی وت:

– من زۆر هەڵەم کردووە.

## سەرم سوڕما

پەرۆشی من زیادو زیادی دەکرد. خانمێك تەمەنی وەکو فریشتە بەسەر بردووە چ هەڵەیەکی کردووە کە ئاوا خۆی بە کەم دەزانێت و دەسووتێت لەناو ئاگری خۆیدا..!

– پورێ منت زۆر مەراق کردووە؟ چی‌یە ئەو هەڵەیەی کردوتە؟

– زۆر گەورەیە.. ڕەنگە نەبەخشرێت، ئەگەر ئەمانە نەبوونایە، ئەوەش نەدەبوو.

تەواو وەکو مەتەڵ قسەی دەکرد. هیچ لەوەی دەیوت تێنەدەگەیشتم یان دەیویست باسی نەکات.

بە مەراقەوە دوا شانسی خۆمم تاقی کردەوە:

– بۆ خاتری خوا چی بووە پورێ گیان؟

-قوربانت بم، سالێکی تەواوە خەوەکان بچڕاون. نە پێغەمبەر، نە مامۆستاو نە هاوسەرەکەم نابینم لە خەونەکانمدا..

مانای ئەوەیە هەڵەی گەورەم کردوە. لەبەرئەوە ئیتر نایەنە خەونەکانمەوە هاتوومەتە ئێرە تا داوای لێخۆش بوون بکەم، ڕوو بکەمە پێغەمبەرو ئەم بەیانەم بکەم.

- باشە چین ئەو هەڵانەی بوونەتە هۆی ئەمە؟

ژنە پیرەکە بە هەنسکی گریانەوە، سەری داپۆشراوی ڕاوەشاند، لەگەڵیشیدا "خوایە بمبەخشە"ی دەوت و دەسووتاو هەناوی پارچە پارچە دەبوو..!

لە کۆتاییدا ئەو "هەڵە"ی دەیوت و سەرسامی کردبووم کەوتە باسکردنی:

- قوربانت بم، گەشتومەتە ئەم تەمەنەم بەبیرم نایەت نوێژم واز لێهێنابێت. ئەوەی کە ڕوویدا ئەو ساڵەی ڕابردوو بوو.

ڕۆیشتینە ئاهەنگی خزمێك. کات تێپەڕی، عەسر گەیشت بوو.وتم بچم نوێژەکەم بکەم، بەڵام ئەو شوێنە نامۆو غەریب بوو جێیەکی گونجاوم نەدۆزیەوە. کەمێکیش کەمتەرخەمیم کرد نوێژی نیوەڕۆم تێپەڕی و لەکیسم چوو.

## پورێ لە دنیای تردا خەیاڵ بردبووی

ئەو پورە بەتەمەنەی تەنیشتم لەناو دنیای پڕ حەسرەتیەدا ئەوەندە بە توندی خۆی دا بە سەر قۆڵەکانم و کەوتە هەنسك دان.

– قوربانـت بم بیسـتت؟! چ گونـاهێکم کـردووە. مـن لـەناو ئاهەنگەکە خەیاڵ بردبوومی و نوێژەکـەم چـووە. ئەمـە چ هەڵـە و گوناهێکە.. ئێستا تێگەیشتی؟!

بەتـەواوی سەرسـام بـووم لـەم خانمـەی خـۆی دەکوڵانـد لـە ئازاردا.. بەڵێ سەرسام بووم. زمانم گیرا، نەمدەزانی بڵێم چی..

خودایە ئەمە چ خۆبەدەستەوەدان و پشت پێ بەستنێکە!.. چ بەندایەتی و ئیمانێکە!

لەبەر نوێژێکی نیوەڕۆ کە چووە نەفرین لەخۆی دەکات.. ئـەی من چی بکەم؟ ئەوەندە گوناهم کـردووە ئەوەنـدە هەڵـەم کـردوە، سەرپێچیم کردوە..

ئێمە تەواو بووین و ئومێدێکمان بۆ نەماوەتەوە...

ئاە پورێ ئاە! تۆ لـە کوێـوە هاتیتـە بـەردەمم؟ لـەکوێوە ئـاوا هاتیت؟ ئەوەی تۆ هێشتا دەژی؟ تۆ هی سەردەمی هاوەڵانیت؟!

مانای ئەوەیە لـە سـایەی فریشـتەی وەك تـۆوە کـە لەناومانـدا دەژی ئێمەش بەپێوە وەسـتاوین. ئەگـەرنا کۆمەڵگـە لـە بەرامبـەر ئەو هەموو گوناهە خۆی ڕاناگرێت، دنیـا لـەتاو ئـەو هـەموو تاوانـە ڕاگـیر نابێـت.. ئـەم هـەموو هەڵەیـەی هەڵنـەدەگرت و قیامـەت هەڵدەستا..

زۆر باش تێگەیشتم کە بۆچی شەرەفمەند نەبووین بە تـەنانـەت بینینی ئەو دیمەن و خاك و زاتانە لە خەویشدا، کاتێك ئـەو خانمـە

باسی کرد کە لەبەر لەدەست چوونی نوێژێك یەك ساڵە لە خەون بینین بە ئەوانەوە دابڕاوە.

ئەی خوای گەورەم! ئەگەر لێخۆشبوونی تۆ نەبێت ئێمە ماندوو ئەبووین، تەواو دەبووین، پەرێشان دەبووین.

بەڵێ ئەم تاقیکردنەوەی بەندایەتیەم تەواو نەبووبوو. ڕەنگە تازە دەست پێبکات. ئەمە تاقیکردنەوەیەکە کە تا ئەمڕۆش ئەوەی بەسەرمان دێت هەمووی خێری تێدایە بۆمان و پڕە لە قورسی و پەندو حیکمەت.

خودایە لەکارەکانی تۆدا هەرگیز حیکمەت نابڕێت. حیکمەتەکانت سەر گێژدەکات. بیرکردنەوەکان سەرەوژوور دەکات.

کە خۆمان ئامادەکردماڵئاوایی لە مەدینە بکەین، پێم وترا: "بوەستە.. تۆ دەبێت گەورەترین سەرسوڕمانی ژیانت ببینیت، هەتا ئەوە نەبینیت بۆ کوێ دەچیت؟!"

هەرواش بوو.. ئەو کاتەی ئومێدو جوانی و لێخۆش بوون و مژدەکانی ئەوێم تیادا دەژیا، قەدەری ئیلاهی قەڵەمێکی لەمانە داو ڕووداوێکم بینی کە هیچ بیرم لێ نەکردبووەوەو چاوەڕێی نەبووم. کە تا ئێستاش سەرسامی ئەو حیکمەت و نهێنیەم.

دوای ماڵئاوایی زۆر سەخت و خەمبارم لە پێغەمبەر، بەزۆر خۆم گەیاندە ئوتێلەکەم. ئاهم دەکرد لە گوناه و هەڵەکانی

ڕابـردووم. چـونکه ئـەو نـوورەی خـەیاڵم دەکـرد نەمدۆزییـەوەو نیشانەیەکی ئومێدەوار بوونم دەست نەکەوت.

تەواو لە خەیاڵ خاوییـدا بـووم. لەگـەڵ ئـەوەی لـە گـەورەترین چاوەڕوانی و داواکاری ئـەم خاکـە پـیرۆزەدا فـڕی بـووم. هۆکـاری سەرەکی ئەم خەیاڵـە ئـەو ڕابـردووە بـوو کـە پڕبـوو لـەو گونـاه و تاوانەی کە جوانیم تیا فرۆشت بوو. لە یەخەم نەدەبووەوە.. ئـاه ئەو جوانیە چی پێ لەدەست نەدام؟

ئـەو سـەیدایەی لـەبیرناکرێ و ئـەو تەمەنـە گەنجیـەم و هـەموو خەیاڵـە جوانـەکانم.. ئێسـتا لـەناو گونـاهی ئـەو تەمەنـە لـەناو چـووەدام. تـا ئێسـتا ئـەو گوناهانـە ڕێگـری جوانیـەکانن لـێم.. لەوانەیە ئەگەر ئەو هەڵانەم نەبوونایـە، لێـرە لـە جێگـەی خەفـەت خواردن، فرمێسکی خۆشی و مژدەم بڕشتایە..

چەندە گریام. چەندە پەرت پەرت بووم نازانم.. بەجۆرێك زمانم دەماخمی خواردبوو لە پاڕانەوەو لاڵانەوەدا..

وتم چایەك ئامادەبکەم. ڕۆیشتمە چێشتخانەی ئوتێلەکە..

دەستم برد بۆ غازی تەباغەکە تـاکو ئاگرەکـە هەڵبکـەم، نـازانم دەستم بەری کەوتبوو هێشتا یان نا، تەقینەوەیەکی سـەیر ڕوویـدا وەکو تۆپی ئاگر.. تێنەگەیشتم چی بوو..

تەواو لە سەرسوڕماندا خۆم لەناو ئاگردا بینیەوە.. لەناو هاوارو ناڵەو داوای یارمەتیدا.. دواییەکـەیم بـەبیر نایـەت.. ئـەوەی کۆتـا

بەبیرم بێت ئەوە بوو خۆمم لەناو ئاگرێکدا بینی کە تەواو وەك دۆزەخ بوو.. خودایە لەو سووتانە.. ئەو گەرمیە.. ئەو ئازارە.. ئەو ناڕەحەتیەی، مرۆڤ تەواو دەکات.. هەرگیز باس ناکرێت.. ئەگەر کەمێکی تر بەردەوام بێت، مرۆڤ دەکەوێتە خەیاڵی بڵێسەکانی دۆزەخی هەمیشەیی..! بیر لێکردنەوەیشی مرۆڤ پەرێشان دەکات.

کە بە هۆش هاتمەوە، بینیم لەشوێنی چاودێری و چارەسەری بەپەلەی نەخۆشخانەیەکدام، لە دەوروبەرم خەڵکی ڕاکردوو و سەرسوڕماو دەبینم، ئۆزلەم خان و نورای خان کە توند دەستیان بە قەرەوێڵەکەوە گرتبوو لە پەرۆشی و سەرسوڕماندا لە هۆش خۆیان چووبوون.

## برژابووم

دادە ئۆزلەم وتی: "خەمت نەبێت نیلوفەر خان، هیچت نیە سووتانێکی کەمە". من تازە خەریك بووم تێدەگەیشتم لە ئازارو ئەو ناڕەحەتیەی لە ئاگرەی وەك دۆزەخدا بینیم. هێشتا سووتانی ڕووخسارم نەدی بوو، بەڵام لەو ئازارو ناڕەحەتیە زۆرەوە هەستم بە هەواڵی سووتانێکی گەورە دەکرد.

ئەوە ئەوەندە سووتان و ئازارێکی بەهێز بوو کە وامدەزانی هێشتاش لەناو بڵێسەی ئاگرەکەدا خەریکم دەسووتێم. وەك ئەوەی سەدان قەساب بە چەقۆکانی دەستیان لاشەیان پارچە

پارچە دەکردم. ئازارێکی بەرگەو ئارام نەگیراو تەنها لاشەم نا، بەڵکو دڵ و ڕۆحیشمی دەسووتاند.. من لە ئازارو زەحمەتدا نە کەسم دەبینی، نە کەسم دەبیست.

دوای یەکەمین چاودێری کردن، لەبەرئەوەی سووتانەکەم زۆر زۆر بوو منیان زوو ناردەوە تورکیا.. ئۆزلەم خانی پزیشك هاوڕێیەتی کردبووم. ناخ و هەستی سووتاوم لەو شوێنە پیرۆزانە بە سووتاویی بەجێ هێشتبوو..

نهێنی و حیکمەتێکی بچووك کە هێشتا نەمدۆزیبووەوە، خستمیە تاقیکردنەوەیەکی بەرگە نەگیراوی ترەوە.

چارەسەرم لە نەخۆشخانە زۆری پێ چوو.. شەوو ڕۆژێکم وەکو ساڵێك لێ دەڕۆیشت.. دەیان شەوم بە ئازارو ناڵەی بەکوڵەوە ڕۆژکردەوە. ئەوەی خوا نەیەوێت بیمرێنێ نامرێت ئیتر.. پزیشکەکان سەریان سوڕمابوو ئەمەیان بە موعجیزە دەزانی، کەم کەس وەکو ئەم سووتانەی منی بەسەر هاتبێت ژیاوە.. مانای ئەوەیە تاقیکردنەوەم تەواو نەبووە، خوا ڕێگەی بە مردنم نەداوە جارێ.

## کە خۆم لە ئاوێنەدا بینی حەپەسام:

دوای ئەوەی برینپێچەکەیان لە ڕووخسارم کردەوە، تێگەیشتم ئەو سووتانە چی بەسەر هێناوم. خوایە ئەو ساتەم چۆن لەبیر دەچێ، ئەو سەرسوڕمانەم چۆن بەسەرهات؟!

که خانمی پەرستیار ئاوێنەیەکی بۆ ڕاگرتم و خۆمم بینی، تەواو حەپەسام و پەشۆکام، هاوارم کرد "نابێت، خودایە!".

سەیری ئەو ڕووخسارە بکەن.. سەد شایەتت دەوێ تا بڵێن ئەمە ڕووخسارە... لە حاڵێکدابوو.. وەك ئەوە بوو لێوو گۆناو ڕووخسارو چاو و لوت هەمووی لە تاوەیەکدا سورکرابووەوە..

لەحاڵێکدا بوو تواناى سەیرکردنی ئەستەم بوو.

بەرگە گرتنی ئەمە ئاسان نەبوو.. ئەگەر "پەیامی بیماران"ی سەعیدی نورسی نەبوایە هەرگیز من نەدەهاتمەوە سەر خۆم. ئۆزلەم خان و نورای خان خوا لێیان ڕازی بێت ئەوانە دۆستی ڕاست و بەوەفان، خوشکی دیندار ئەمانە بوون. گەورەترین دەوڵەمەندی مرۆڤ هەبوونی دۆستی بەوەفایە. چونکە ئەوانە مرۆڤی ڕۆژی تەنگانە و ناڕەحەتین.

جارێکی تر تێگەیشتم لەو جوانیەی ئیمان بە مرۆڤی دەبەخشێت.

سەیری کاری ئەو خوا گەورەیە بکەن. لەوەی کە منی خستوەتە ناو ئەو ئاگرەوەو بەم جۆرە سووتاندومی، حیکمەتێکی گەورەی تیا داناوەو نامەیەکی بۆ ناردووم. ئەمەیە هاوکاری ئۆزلەم خان تێگەیشتم.

ئەو جوانیەیەی بووبووە بەڵا، ئەو شۆخ و شەنگیەی منی بەو هەموو گوناهە گەیاندبوو، ئەو لاشە پاکەی کە منی لە گوناهەوە

بۆ گوناه بردبوو، ئەو بردیەوەو بە سووتانێك سڕیەوە.. إن شاء الله لەو گوناهانەی ڕابردووشم خۆش بووەو ڕزگارم بووە. چونکە ئەو ڕابردوو جوانیەی کە لە دۆزەخدا ژیاندمی، بە حیکمەتێکی سەرسوڕهێنەری خوا سووتاو نەما...ئێستا من شاجوانێك نیم لە جوانیدا، بەتەواوی شاجوانی ناشرینەکانم... ئیتر دەرگایەك نەماوەتەوە بۆ مرۆڤە خراپەکان و شەیتان و نەفس کە لێی بدەن.

إن شاء الله ئەمە ڕزگابوونی منە..

## بەڵام سەرسوڕمانەکانم تەواو نەدەبوون:

کۆتا سەرسوڕمانم جیاوازبوو.. ڕەنگە لە سووتانم لەناو ئاگرەکەشدا زیاتر کاریگەرترو سووتێنەرتربوو بێ.. ئەوەیشی منی بە تەواوی هێنایەوە بە خۆمدا سووتانەکەم نەبوو بەڵکو ئەم ڕووداوەی کۆتایی بوو..

بەڵێ، ئەمە کۆتا پەردەی ژیانم بوو.. کۆتا فریادی ڕۆحم و ئازاری دڵم بوو.

سەیدا..

بەدرێژایی نەخۆشیەکەم نەبینینی سەیدا لەو دەوروبەرەدا سەرنجی ڕاکێشابووم. من لەم حاڵەمدا لەبەرئەوەی بێ ئەدەبی نەکەم لە ئۆزلەم و نورای خانم نەپرسی.

دانە دانەی هاوڕێکانم کە پێکەوە چووینە عەمرە هاتنە سەردانم و سەیدا هەر نەبوو..

ئایا زۆر لە من بێزارو ناڕەحەت بوو؟!

ئەمەم بۆ لێك نەدەدرایەوە..

کاتێك کە لەگەل نورای خان بەتەنها بووین، ئەم بابەتەم کردەوە.

- نیلوفەر گیان، ئەگەر دەتەوێ ئەم بابەتە لەگەڵ ئۆزلەم خان بکەرەوە باشتردەبێت، هەروەها زانیاریەکی ڕووناککەرەوەشت پێ دەلێت..

بەلاَم ئەم وەلاَمە بۆ من بە نەبوو.. کە ناوی سەیدا لە دەمی هاتە دەر هەستم کرد چاوەکانی پڕبوون و جۆرێك ئەندێشاوی دەرکەوت. لە وەلاَمدانەوەشدا سەیری ڕاست و چەپ و دەنگی لەرزیوی، منی پەرۆش و پەرێشانتر کرد.

زۆرم لێکردو وتم: تۆ شتێك لە من دەشاریتەوە؟

وەلاَمی نەداوە تەنها دووبارەی کردەوە:

- لەگەڵ ئۆزلەم خان قسە بکەیت باشترە.

زۆری پێنەچوو ئۆزلەم خان هات.

کە ئەو خەمباری و بێدەنگیەی ئێمەی بینی بە نیگا پەرۆشەکانیەوە پرسی:

- خێرە؟ شتێك بووە؟ خزمەتکار شتێکی کردووە؟

وتم:

- نا. شتێك نیە، زۆرباشە.. بەلاَم..

- بەڵێ، بەڵام..

ئەو ناوەی بە گرنگیەوە لە دڵمدا شاردبوومەوە، بەبێ ویستی خۆم لە دەمم هاتە دەر..

- سەیدا...

یەکسەر نیگای چاوەکانی ئۆزلەم خان گۆڕا، هێڵەکانی ڕوخساری قوڵبوونەوە...

- سەیدا نەهاتۆتە سەردانم، هەڵەیەکم کردووە؟ یان بابەتێك هەیەو نایزانم! زۆر پەرۆشم..

ئۆزلەم خان و نورای خان تەماشایەکی یەکیان کرد، بە چاوەکانیان هێمایان بۆ یەك دەکرد وەك ئەوەی بڵێن "تۆ بیڵێ، نا تۆ بیڵێ" .

لە کۆتاییدا ئۆزلەم خان لەلام دانیشت، ئەو بە خوێن ساردی تایبەت بە خۆیەوە کەوتە باسکردنی. نورای خانیش سەری داخست بوو، خۆی بۆ ئەو پێشهاتانە ئامادەدەکرد کە ڕوو دەدات. وتی:

- نیلوفەر، هاوڕێی خۆشەویستم.

دەستی هێنا بە سەری سووتاومدا و بە هێواشی گرتمیە ئامێز.

- سەیدا تەنها بۆ تۆ نا، بەڵکو بۆ ئێمەش هاوڕێیەکی خزمەتکارو بەبەهای دینە.. ئەو تەنها تۆ خۆشت نەویست.

ژمارەی ئەو گەنجانەی خۆشیان دەویست، ئەو کەسانەی دوعایان بۆ دەکرد، ئەوانەی یارمەتیان لە ئەو بینیبوو کەسمان نایزانین...

سەیدا ژیانێکی وەکو فریشتە بردە سەر، ئەو بەتەواوی عاشقی خواو پێغەمبەر بوو. بەلام ئەو بلێسەی ناو ڕۆحی هەر ڕۆژەو هەنگاو بە هەنگاو ئەوی لەکۆتایی نزیك دەکردەوە. چونکە گەورەترین حەسرەتی ئەو گەیشتن بوو بە پێغەمبەرو مامۆستا نورسی و هاوسەرو منالەکەی.

پێمبڕی:

– خوشکم من ئەمانە دەزانم، بۆچی لە سەرەتاوە بۆم باس دەکەیتەوە؟

## "لەناخەوە هاوارم دەکرد " بگەرە کۆتایی:

ئۆزلەم خان هەر نەدەگەیشتە ئەو خاڵەی مەبەستی بوو بیڵێت. زۆر باش لەوە تێدەگەیشتم. بێ ئارامیشم لەمەوە سەرچاوەی گرتبوو.

بۆئەوەی فرمێسکە گەرمەکانی چاوی بشارێتەوە سەری دادەخست و بەرزی دەکردەوە. وتی :

– دەبێت بەرگە بگریت.. لەبەرامبەر قەدەری خوادا ناکرێت ڕاوەستین نابێت نارەزایی دەربڕین. ئەرکی ئێمە تەنها خۆ بەدەستەوەدان و پشت بەستنە.

بەلام من لە حاڵێکدا نەبووم بەرگە بگرم:

– خوشکم قسەکانت وەك مەتەڵە، چی بووە؟

تێگەیشتبووم، پێویستی نەدەکرد وەڵام بداتەوە، بەڵام ئەم هەواڵە ئەوەندە گەردەلولێکی گەورە بوو، ئەوەندە سووتێنەر بوو، لەوانەیە بڵێم ملیۆنان جار ئەوەندەی سووتانی گیانم ئازاری دام.

هەستم بە کوڵانی گەرد بە گەردی ناخم، سووتانی دڵم دەکرد.

"سەیدا ڕۆیشت، ها؟!"

ئای خودایە، ئەی من بۆچی دەژیم!

وەك بڵێی لە ساتێکدا عەقڵم لەدەستدا. وەك شێت و دێوانەم لێهات. نازانم چیم وت و چیم کرد تەنها هاوارم کرد:

– بۆچی دەژیم من؟

چەندین ڕۆژە دەناڵێنم، چەند مانگێکە سووتام.

دابڕابووم، دوورکەوتبوومەوە، بێزاربووم لە دنیایەك کە ئەوی تیا نەمابێت. ئیتر چاوەکانم بەردەوام شێداربوون بە فرمێسك، شەوانم بە خەو بینین بە سەیداوە تێدەپەڕی.

سەیدا کۆتا ڕۆژمان لە مەدینە، واتە هەر ئەو ڕۆژەی من تیایدا سووتام و برژام، بەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و شەکرەوە ئەویش براوەتە نەخۆشخانە. سەرەڕای ئەوەی پزیشك پێی وتووە "بەهیچ جۆرێك هەڵناستیت و ناڕۆیتە دەر" بەڵام ئەو بۆ زیارەتی ماڵئاوایی چووەتە مزگەوتی پێغەمبەر. نوێژی نیوەڕۆی ئەنجام

داوە پاشـان لەگـەڵ کـاك مـەتین چـوونەتە باخچـەی بەهەشـت (ڕەوضەی مطهرە) لەوێش دوو ڕکات نوێژیان کـردووەو سـەیدا لـە شوێنی خۆی کەوتووە...

خودایە لەناو ڕەوضەدا..! وەك ئەوەی بچێتە بەهەشت.. ئـەی ئەو کۆتا وشانەی! خودایە چی دەبێت بیکە بەنسیبی ئێمەش.

لـە کۆتـا ڕسـتەدا وتویـەتی: "سـەروەرەکەم، ئـەم بەنـدە گوناهبارەی ئوممەتەکەت شیاوی گەیشتن بە تۆ نیە".

بە شایەتومانەوە گەیشتوەتە ئـەو جیهانـەی حەسـرەتی بـوو.. بە دیداری ئەو خۆشەویستەی گەیشـتوە کـە چـەندین سـاڵە بـۆی دەژی...

## من ئیتر لەم دنیایە خۆم ناگرم

ئەو ڕۆیشت.. من لێـرەم.. بـەڵام لـە ماوەیـەکی کورتـدا منـیش دەڕۆم. دووبارە سـەردانی ئـەو جێگـە پیرۆزانـە دەکـەم. دووبـارە دەچمە خزمەتی پێغەمبەر. دەمەوێ بۆ دواجار سەرنج بخەمە سەر ئەو جیهان و دنیایەی، ئەو جێگـە پێیانـەی پێغەمبـەر. کـە سـەیدا تەمـەنێك بـۆی دەژیـاو بـە عەشـقی هەمیشـەیی گەیشـت.. کـێ دەزانێت، ڕەنگە خوای گەورەم ڕەحم بـەم گوناهبارەشـی بکـات و منیش دوا ساتی ژیانم لەوێ بێت. بـۆ ئـەو هـەموو ڕۆژێـك، هـەموو ساتێك حەسـرەت و سـووتانەکانم نـازانم چۆن بـاس بکـەم. تـەنها دڵنەوایيم ئەمەیە. من بۆ ئەمە دەژیم. داوایەکی ترم نیە لە خوا.

ئەو بەسەرهاتی ژیانەی کە دنیای ڕۆحانی پارچە پارچە کردین، جۆش و خرۆشی خستە بیرکردنەوەکانمان و بە حەسرەت و پەرۆشی گوێمان بۆ گرت. لێرەدا تەواو نابێت.

کۆتا ڕستەکانی بۆ وتین، بۆ چاوە فرمێسک ڕژاوو گوێیە کاریگەرەکانمان. بەڵام ئەو دیمەنەی کە لە کۆتاییدا لە نیلوفەر خانمان بینی ئەوەیە کە بە درێژایی تەمەنمان لەبیری ناکەین. هەروەها بە وتنێکەوە ئەقڵ لە مرۆڤ دەستێنێت. "خودایە کۆتاییەکی بەو جۆرە پڕ حیکمەت و پەندە بە ئێمەش نسیب بکە".

کۆتا دیمەنی نیلوفەر خان کە تا قیامەت بە نهێنی و لە خەیاڵماندا دەمێنێت لە ئۆزلەم خان بیستمان.

ئۆزلەم خان کە هێشتاش لەناو چڕی هەستەکانیدا دەژیا، لە بێ هۆشی خۆشی باسی دەکرد. کۆتاییەکانی ژیانی نیلوفەرخان.

– ئەومان بۆ نەدەوەستێنرا بەجۆرێك.. بە نیوە گیانیەوە دووبارە ڕۆیشتەوە بۆ عەمرە.. لەبەر شەکرەو فشاری خوێن و نەخۆشیەکانی تری بە نارەحەت بەپێوە دەوەستا.

بەڵام گوێی بۆ نەگرتین. وتمان لەمە حیکمەتێك دەبێت هەبێت. زۆرمان لێ نەکرد.

هەستی ناخی ئەم جارە زۆر بەهێزە، زۆریش چڕ بوو، زۆر بە گەرم و گوڕی بوو. ئەم جارە ئەوەندە بەهێز ئەم نامەیەی بۆ

هاتبوو "ئەوانەی بانگ دەکرێن، دەچنە ئەو خاکە پیرۆزەوە". کە هەستەکانی دەڕۆیشتن و ئەو دەنگە بەنهێنی ئاوا دەبیستڕا:

"وەرە، ئیتر تاقیکردنەوەکەت تەواو بوو. ئەو خوا گەورەیەی بەندەکانی زۆر باش دەناسێت. ئەم جارە هەتا کۆتایی دەرگای ڕەحمەتی لەتۆ کردۆتەوە، وەرە ئامێزی میهرەبانی سەروەرمان چاوەڕێت دەکات. ئەو کۆتا ئاگرە جگە لەوەی لاشەتی بە گوناهەکان پاککردەوە، ڕۆحیشتی شت و پاکژبووەوە. وەرە ئیتر..".

لەم دەنگە ئەفسووناویەی زیاتر هیچی تری لێ نەدەبیستڕا. گوێکانمان دەنگی دنیایان داخرابوو. زوو زوو دەیوت "خوشکم، من بانگ دەکەن.." . هیچی تری نەدەوت.

نیلوفەر خان کە چەند ساڵێکە بە عەشقی ئەو پەیامەوە دەسووتاو هۆگر بووبوو بەرەو ئامێزی دنیاری سەروەرمان فڕی و ڕۆیشت.

وەك ئەوەی ڕۆحی لە لاشەی جیابووبێتەوە، لە گیانی دابڕابێت لەناو دنیای فریشتەکاندا خەیاڵاوی بووبوو.

ئەو خۆشحاڵیەی کە تا ئەو ڕۆژە لە ڕوخساریدا نەبینرابوو، ڕۆیشتنی ئەوی بەرەو کۆتاییەکی پڕ پەند دەردەخست.

ئەندێشە بردیەوە لەو خاکە پیرۆزانەی ئەوێ. لە دانە دانەی درگا کراوەکانی ڕەحمەتی خواوە ڕۆیشتە ژوورەوە. خۆی فڕێدایە

شامێزی میهرەبانی و شەفاعەتی بێ ئەندازەو ئاسوودەیی و هەمیشەیی سەروەرمان.. ئاه لەو دنیا نهێنیانەی لەوێ تیایدا دەژیا.. من چۆن باسی بکەم و ئێوە چۆن دەینوسنەوە؟!

ئەو دنیایەی لەوێ ئەو تیایدا دەژیا نە ئەقڵ دەیبڕێت، نە ڕێگەی مەنتقی دەچێتە سەر.

وەکو بەندەیەکی هەست خۆشاو لەناو ڕیزدا چاوەڕێی چوونە ناو بەهەشت بێت، ئەو شەوەی کۆتایی لەگەڵ ڕژانی فرمێسکەکانیدا لەسەر بەرماڵەکەی سەری بەرز نەکردەوە. ئەوە کۆتا کڕنووشی ئەو بوو.. ڕۆحی سووتاوی بە عەشقی ئەو و لاشەی سووتاوی لە دنیادا بۆ هەمیشەیی لەو کڕنووشەدا بەجێ هێشت و خۆی فڕێدایە باوەشی میهرەبانی پێغەمبەر..

هەڵبەت لە تەنیشتی گۆڕی پێغەمبەر کاتێك لاشەی کەونویان لە کڕنووشدا برد، کەسێك نەما تەماشای ڕوخسارە پڕ نوورەکەی و زەردەخەنە هەمیشەییەکەی سەرلێوە سووتاوەکەی نەکات.

نیلوفەر خان بەو عەشقەی لە دەروونیدا بۆی دانەمرکایەوە، بەو خۆشەویستییە بێ ئەندازەیەوە گەیشتە ئەو دنیایەی تر و ژیانی هەمیشەیی.. ئێستا ئەو لای خۆشەویستی خۆشەویستەکان، سوڵتانی سوڵتانەکان، لەو ژیانە دانەمرکاوەدا دەژی.

نیلوفەر خان لەکۆتاییدا ئەوەی دۆزیەوە کە لەتەمەنی پڕ نەهامەتی و ناڕەحەتی بۆی دەگەڕا. چونکە خوا پەیمانی داوە

"کێ چی بوێت پێی دەبەخشم".. هەرواش بوو. خوا سالانێك بوو داواکاریەکانی بە نیلوفەرخان بەخشی بوو کە لە حەسرەتدا دەژیا

* * *

لەپشت ئەم هەموو ئەزموونانەی ژیانەوە، دەزانن ئەرکی ئێوە چیە؟

ئایا کاتی ئەوە نیە لێکدانەوەیەك بکەن بۆ ئەو پەیامانەی کە بە گەرمی ئەم بەسەرهاتی ژیانەی دنیای ڕۆحانیمان بە پەند وەردەگرێت و مرۆڤ پەرێشان و حەیران دەکات.؟!

کەوابێت، دەبێت بڕیار بدەین کە بۆچی دەگەڕێین و دەمانەوێت چی بدۆزینەوە؟! هەزاران ئەزموونی ژیان دەریان خستووە کە ئەوەی بە دڵ و گیان بگەڕێت، بەدڵنیایی ئەوەی دەیەوێت دەیدۆزێتەوە.. مەولاکەی و بەلاکەیشی...

کەواتە ئایا هیچ بیرمان کردۆتەوە، ئێمە بۆ کامیان دەگەڕێین؟!

## کۆتایی



# پێڕست

# ARADIĞINI BULAN KADIN

## HALİT ERTUĞRUL

ئەم کتێبەی لە بەردەستاندایە، درێژەو بەشی کۆتایی کتێبی (ئەو ئافرەتەی لە دووی خۆی دەگەڕێت)ە، واتە بەشی دووەمی چیرۆکە دڵهەژێن و سەرنجڕاکێشەکەی خاتوو "نیلۆفەرە".
کتێبی (ئەو ئافرەتەی لە دووی خۆی دەگەڕێت) خوێنەرێکی بەرچاوی هەبوو. هەر لەبەرخواستی زۆری خوێنەرانی، بەشی دووەمی کتێبەکە (ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزییەوە) مان خستە بەردەستی جەنابتان، بۆ ئەوەی بزانن ئافرەتە ونبووەکە لەدووی چی دەگەڕاو چی دۆزییەوە. پێویستە ئەم کتێبەش کە حەشارگەی هەست و سۆزە بخوێننەوە. ئەوسا دەبینن کە ئێوەش بەشێکن لەم چیرۆکە پڕ نهێنییەی (ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزییەوە) تاسەو خەیاڵەکانتانی لەخۆگرتووە، واتە خۆیشتان لەناو ئەم چیرۆکی ژیانە ئەفسوناوییەدا دەدۆزنەوە.
ئەم کتێبە دەبێتە هۆکارێکی کاریگەر لە ژیانتاندا. گەر خۆتان بە ئامادە دەبینن بۆ بەسەرهاتێکی وەها پڕ نهێنی و سەرنجڕاکێش، فەرموون..

ISBN 0-0091-0000-8



نرخی (٣٠٠٠) دینارە